مەحوی 2



وەرگێرانی کیتابی

# التحفة السنية

## بشرح المقدمة الآجرّومية

وەرگێرانی : خالص حسن أحمد

چاپی یەکەم - هەولێر
٢٠١٣

وەرگێڕانی کیتابی

# التحفة السنية

## بشرح المقدمة الآجرّومية

وەرگێڕانی : خالص حسن أحمد

چاپی یەکەم - هەولێر
٢٠١٣

بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی مەحوی 2

mahweeshop@yahoo.com
00964 770 652 1662

ناوی کتێب: وەرگێرانی اَلتُّحْفَةُ السَّنِّيَة

بابەت : رێزمانی عەرەبی

وەرگێرانی: خالص حسن احمد

نەخشەسازی : کۆمپیوتەری ( هیـــوا )

تیراژ: دانه

چاپ: یەکەم / ٢٠١٣

چاپخانە :

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٢٣ )ی ساڵی( ٢٠١٣ )ی پێدراوە

# الفهرست

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

**إنّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا، من يهده الله فلا مُضِلَّ لَهُ ومن يُضلل فلا هادي لَه، واشهد ان لا إلـه إلا الله وحدهُ لا شريك لَـهُ، واشـهد ان محمداً عبدهُ ورَسولُهُ...**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ **(آل عمران:١٠٢).**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا﴾ **(النساء:١).**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلاً سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾ **( الاحزاب: ٧٠-٧١).**

**اما بعد..... فانّ اصدق الحديث كتابُ الله، وخير الهدى هدى (محمد)**

(ﷺ) وشر الأُمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكُل ضلالة في النار

لەدوای کۆشش و ماندووبونێکی زۆرم بەدوای فێربوونی ڕێزمانی عەرەبی دا پێم باش بوو بۆ قیامەتم لەم ڕێگایەدا تەرجەمەی ئەم کیتابە بکەم بۆ زمانی کوردی وە لە هەندێ شوێنیشدا نیمچە ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر بدەم وە ئیعرابی گەلێك بەشە ئایەت و رستەو هۆنراوەی تیادا بکەم .

ئەم کیتابی (التحفة السنية) واتە: دیاری بەنرخ، زانیاریەکی زۆری تێدایە، وە لەزۆر شوێنانیش بەدەرس دەخوێنرێ جا لێرە ئەگەر من زۆر درێژیشم نەکردبێتەوە روون کردنەوەی زۆریشم دەربارەی نەدابێ پێم وایە قوتابی ئەگەر لەسەرەتادا هەر ئەوەندە فێربێت کە لەم کیتابەدا هەیە ئەوە شتێکی زۆر فێربووە ، جا پێم وایە شتێکم لەم کیتابەدا کردبێ کەم یا زۆر ببێتە مایەی ئاسانکاری هەم بۆ مامۆستاو هەم بۆ قوتابی

وەپێم باش بوو کۆمەڵێك سەرە بابەت و ووشە هەروەك و خۆیان بیانهێڵمەوە تەرجەمەیان نەکەم بۆ کوردی وەك(فاعل – مبتدا– مفعول بە– فعل ماضي– فعل مضارع) و لەم جۆرە ، هەر چەندە کە لەسەرەتای بابەتەکەوە هاتوون تەرجەمەکەیم لە بەرامبەری نووسیوە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی زۆر لەم ووشانە لەبەراوێزدا شەرح و لە پەراوێزەکەدا ڕوونکردنەوەم لەسەری داوە ، بەڵام لەکاتی باسکردن و شەرحی بابەتەکە زۆرانێك لەم ووشانەم هەروەکو خۆیم هێشتۆتەوە ئەمەشم بۆ ئەوە کردووە کە کێشە بۆ خوێنەران دروست نەبێت.

ئەو نوسراوانەی کە لەنێوان دوو کەوانەی بەم شێوە [ .... ] نوسراون ئەوە تەرجەمەو لێکدانەوەی کیتابەکە نییە بەڵکو روون کردنەوەی خۆمن.

وە داواکارم لە هەموو مامۆستاو قوتابیەکی رێزمانی عەرەبی کاتێك کە خۆ خەریك دەکەن بەم زانستە چ وەکو گوتنەوە چ وەکو فێربوون با نیەتیان هەبێت نیەتەکەشیان لەبەر خوا بێت بۆ ئەوەی ماندوو بوونەکەیان بە بەلاش نەڕوات، داواکارم لە خوای گەورە ئەم نوسراوەم ببێتە مایەی خێروبێرێکی زۆر گەورە لە دونیاو لە قیامەت بۆ خۆم و بۆ ئەوانەش کە سوودی لێ وەردەگرن.

خوایە داوات لێ دەکەم بەهەرچی ناوی جوانت هەیە لە گوناهەکانمان خۆش بە ، رەحممان پێ بکە، شیفای نەخۆشەکان بدەی ، کاری دونیاو قیامەتمان بۆ ئاسان بکەی، ئەو کەسەی کێشەو نارەحەتیەکی هەیە لێی لاببە ، بمانپارێزە لە عەزابی قەبرو نارەحەتیەکانی رۆژی قیامەت ، وە شادمان بکە بە (فیردوس الأعلى) یا أرحم الراحمين یا أرحم الراحمين یا أرحم الراحمين.

# مقدمة الشارح / پێشەکی شەرح کار

بِسْمِ اللهِ الَّرحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمد لله وكَفَي، وسلامه علي عباده الذين اصْطَفَي[١]

هذا شَرْح واضح العبارة، ظاهر الإشارَة ، يَانِعُ الثَّمَرَة[٢]، دَانِي القِطَاف[٣]، كثير الأسئلة والتمرينات، قصدت به الزُّلْفَي[٤] إلي الله تعالي بتيسير فهم (المقَدِّمَة الآجُرُّومِيَّةِ)علي صغار الطلبة ؛ لأنها الباب إلي تَفَهُّم العربية التي هي لُغَةُ سيدنا ومولانا رسول الله صلي الله عليه و علي آله وصَحْبه وسلم ولُغَةُ الكتاب العزيز.

وأرجو أن أستحق به رضا الله عز وجل ؛ فهو خير ما أَسْعَي إليه

رَبَّنَا عليك توكلنا وإليك ، وإليك أَنَبْنَا ، وإليك المصير ، رَبَّنَا اغفر لي وَلوَالِدَيَّ وللمؤمنين والمؤمنات يومَ يَقُومُ الحساب

---

(1) عباده الذين اصطفى / ئەو بەندانەی کە هەڵبژاردوون ، واتە: پێغەمبەران

(2) يانع الثمرة / بەرو بوومەکەی پێگەیشتووە.

(3) داني القطاف/ لێکردنەوەو ڕنینی (بەروبوومەکە) نزیکە.

(4) الزلفى: نزیکبوونەوە.

# مُقَدِّمَاتٌ[١] : پێشەکیەکان

تعريف النحو ، موضوعه، ثمرته ، نسبته[٢]، واضعه ، حكم الشارع فيه

**پێناسەی (نحو)، بابەتی (نحو)، سوودو بەرووبوومی (نحو)، (نحو) دەدرێتە پاڵ چی، دانەری(نحو)، حوکمی فێر (نحو) لە ڕووی شەرعیەوە.**

التعريف : كلمة" نحو " تطلق في اللغة العربية علي عدَّة معان :منها الْجِهَةُ ، تقول ذَهَبْتُ نَحْوَ فلاَنٍ ، أي :جِهَتَهُ . ومنها الشّبْهُ والمِثْلُ، تقول :مُحَمَّدٌ نَحْوُ عَلِيّ، أي شِبْهُهُ وَمِثْلُهُ .

وتطلق كلمة " نحو " في اصطلاح[٣] العلماء على " العلم بالقواعد التي يُعْرَف بها أحكامُ أوَاخِرِ الكلمات العربية في حال تركيبها[٤] : من الإعراب[٥] ، والبناء وما يتبع ذلك " .

**پێناسە: ووشەی (نحو) لە زمانی عەرەبیدا بۆچەند مانایەك بەکاردێت لەوانە: (الجهة) ڕووەو، بەرەو دەڵێ ی (ذهبت نحو فلان) واتە : بەرەو**

---

(1) ئەم پێشەکی یە ، پێشەکی (محمد محی الدین)ە کە (مقدَّمَةُ الآجرُميّة) ی شەرح کردووە ، ئەم زانا گەورەیە خەڵکی (مصر) بووە، لە ساڵی (١٣١٨ك-١٩٠٠ز) لەدایك بووە، وە لە ساڵی (١٣٩٣ك-١٩٧٣ز) لە قاهیرە وەفاتی کردووە.

(2) نِسبة: خستنە پاڵ- گەڕانەوە بۆ.

(3) (اصطلاح) واتە : (التعبير الخاص) یانی دەربڕین و مانای تایبەت کە لە کوردیدا ووشەی (زاراوە) یان بۆ داناوە..

(4) تركيب: پێکەوەنان – لێکدان.

(5) (إعراب) گۆڕانکاری لە کۆتایی ووشە (بناء) جێگیربوونی کۆتایی ووشە لەسەر یەك حالەت.

**ئەو، وە مانایەکی تری: وێچوو و هاوێنە دەڵێ ی (محمد نَحْوُ عليّ) واتە بە ئەو دەچێ و هاو وێنەی ئەوە.**

**وە ووشەی (نحو) لە زاراوەی زانایانی (نحو) بەکاردێت بۆ (زانیاری دەربارەی ئەو بنچینانەی کە بە هۆیەوە یاساکانی کۆتاییەکانی ووشەکانی عەرەبی دەزانرێت لە کاتی پێکەوە نان و لێکدانیان لە (إعراب) و (بناء) ئەوانەش کە شوێنی ئەم دووە دەکەون.**

الموضوع : وموضوعُ علمِ النحوِ : الكلمات العربيةُ ، من جهة البحث عن أحوالها المذكورة.

الثمرة : وثمرة تَعَلُّم علم النحو : صِيَانَةُ[١] اللسان عن الخطأ في الكلام العَرَبِّي ، وَفَهْمُ القرّآنِ الكريم و الحديثِ النبويّ فَهْماً صحيحاً، اللذَيْنِ هما أَصْلُ[٢] الشَّريعَةِ الإسلامية وعليهما مَدَارُها[٣] .

**الموضوع: بابەتی زانستی (نحو) بریتیە لە ووشەکانی عەرەبی، لە رووی لێکۆڵینەوە لەو حالەت و بارو دۆخانەی کە باس کرا(واتە: زانینی کۆتاتییەکانی ووشە لەکاتی پێکەوەنانیان).**

**الثمرة: سوودو بەروو بوومی زانسی (نحو) بریتیە لە پاراستنی زمان لەهەڵە کردن لە قسەی عەرەبی ، وە تێگەیەشتنی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم ، بە تێگەیەشتنێکی ڕاست کە ئەم دووەش بنچینەی شەریعەتعی ئیسلامینە ، وە شەریعەتی ئیسلامیش**

---

**(1) صيانة: پاراستن**

**(2) اصل: بنچينه.**

**(3) مَدار : خولگە، شوێنی بەسەردا سووڕانەوە.**

**لەسەر ئەم دوو خولگەیە دەسوڕێتەوە(کە قورئان و سوننەتە).**

نسبَتُه : هو من العلومِ العربية .

واضعه : والمشهور أن أوَّل واضع لعلم النحو هو أبو الأسْوَدِ الدُّؤلِيُّ ، بأمر أمير المؤمنين عليّ بن أبي طالب رضى الله عنه .

حكمِ الشارعِ فيه : وتعلمُه فَرْضٌ من فروض الكفاية . وربما تَعَيَّنَ تعَلُّمُهُ علي واحد فَصَار فَرْضَ عَيْنٍ عليه .

**نِسبَتُه: واتە: خستنە پاڵ ، ئەم زانستە یەکێکە لە زانستەکانی زمانی عەرەبی .**

**واضعه: دانەری ئەم زانستە، ئەوەی مەشهورە یەکەم دانەری زانستی (نحو) (ابو الأسود الدُّؤلي) بوو ، ئەویش بەفەرمانی پێشەوای ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبی تالیب رەزای خوای لێ بێت ئەم کارەی ئەنجام دا.**

**حكم الشارع[1]. فیه: بڕیاری خوا لەسەر فێربوونی (نحو) فێربوونی ئەم زانستە فەرزی (کیفایە) یە (واتە ئەگەر یەکێك یا کۆمەڵێك هەڵسان بە فێربوونی ئەم زانستە بەقەد پێویست ئەوە خێر بەوان دەگات و گوناهیش لەسەر ئەوانی تر لادەچێ) وەهەندێ جار یەکێك پێویست دەبێت لەسەری کە ئەم زانستە فێربێت(چونکە کەسی تر نی یە لەم شوێنە بتوانێ بەم کارە هەڵبستێت تەنها ئەو نەبێت) ئەو کاتە ئەو کەسە دەبێتە فەرزی (عَین) لەسەری کە فێری بێت.**

---

(1) شارع : شەرع دانەر واتە: خوا (حكم الشارع فيه) واتە: حوکمی خوا لەسەر فێربوونی زانستی (نحو).

## بسم الله الرحمن الرحيم

قال المصَنِّف: وهو أبو عبد الله بن محمد بن داود الصّنْهَاجِيُّ المعروف بابن آجُرُّوم ، والمولود في سنة٦٧٢ اثنين وسبعين و ستمائة ، والمتوفى في سنة٧٢٣ ثلاث وعشرين وسبعمائة من الهجرة النبوية. رحمه الله تعالي .

**قال المصَنِّف[1] : دانەر دەڵێ کە (ابو عبدالله محمد بن داود الصنهاجي) یە ناسراوە بە (ابن آجُرُّوم)[2] لە ساڵی (٦٧٢ك) لەدایك بووە وە لەساڵی (٧٢٣ك) وەفاتی کردووە.**

| |
|---|
| قال : الكَلامُ هُوَ اللَّفْظُ[3] الْمُرَكَّبُ[4] الْمُفِيدُ بِالْوَضْعِ . |

**واتە: قسە بریتی یە لە ئاخاوتنێکی پێکەوەندراوی بەسوود کە بە پێی یاسای زمانی عەرەبی بێت.**

وأقول : لِلَفْظِ " الكلام " معنيَان : أحدهما لغوي ، والثاني نحويّ

أما الكلام اللغوي فهو عبارة[5] عَمَّا تَحْصُلُ بسببه فَائِدَةٌ ، سواءٌ أَكان لفظاً ، أم لم يكن كالخط والكتابة والإشارة

وأما الكلامُ النحويُّ ، فلابُدَّ من أن يجتمع فيه أربعة أمور : الأول أن يكون لفظاً

---

**(1) مُصَنِّف : دانەر ، بەڵام (مُصَنَّف) واتە دانراو.**

**(2) (آجروم) : واتە( الصوفي الفقير) لە وولاتی (مغرب) لە شاری (فاس) لەدایك بووە .**

**(3) (اللفظ) قسەکردن ئاخاوتن ، بێژە ، ووتن.**

**(4) (مُركَّب) : پێکەوەندراو – لکێنراو.**

**(5) (عبارة) : دەربڕین، دەستەواژە، رستەیەکی گچکە مانایەك بدات بە دەستەوە.**

، والثاني أن يكون مركَّباً ، والثالث أن يكون مفيداً ، والرابع أن يكون موضوعاً بالوضع العربي .

**وه دهڵێم (واته محمد محی الدین) (لفظ) (کلام) دوو مانای ههیه، یهکێکیان له ڕووی زمانهوه، دووهمیان له رووی (نحو) یهوه.**

**(کلام) له رووی زمانهوه بریتیه له دهربڕینێك که بههۆی ئهوهوه سوودێك وهدهست دێت جا به قسه بگوترێ ، یا به قسه نهبێت وهك هێل کێشان و نووسین و ئاماژه کردن**

**بهڵام (کلام) لێکدانهوهی له رووی نهحویهوه پێویسته چوار شتی تیادا کۆبێتهوه:**

**یهکهم: دهبێ به زار بگوترێ و قسه بێت .**

**دووهم: دهبێ لێکدرابێت و پێکهوهنرابێت.**

**سێیهم: دهبێ بهسوود بێت.**

**چوارهم: دهبێ بهپێی یاسای زمانی عهرهبی بێت و قسهکان عهرهبی بن.**

ومعنى كونه لفظاً: أن يكون صَوْتاً مشتملاً[1] على بعض الحروف الهجائية[2] التي تبتدئ بالألف وتنتهي بالياء ومثاله " أحمد " و " يكتب " و " سعيد " ؛ فإن كل واحدةٍ من هذه الكلمات الثلاث عند النطق بها تكون صَوْتاً مشتملاً عَلَي أربعة

---

(1) اشتمل : تَضمَّن ، احتوى: لهخۆی گرت، تیای بوو.

(2) (الحروف الهجائية) : ئهو پیتانهن له زمانی عهرهبی که بهدهنگ دهخوێنرێنهوه ژمارهیان (٢٩) پیته.

أحْرُفٍ هجائية : فالإشارة[١] مثلاً لا تسمَّى كلاماً عند النحويين ؛ لعدم كونها صوتاً مشتملاً علي بعض الحروف ، وإن كانت تسمى عند اللغويين كلاماً ؛ لحصول الفائدة بها .

**وەماناى كە دەڵێن دەبێ (لفظ) بێت: دەبێ دەنگێك بێت چەند پیتێكی هیجائی لەخۆ بگرێ كە لە ئەلیف دەست پێ دەكات بە یاء كۆتایی دێت وەك (احمد) وە (یكتبُ) وە (سعید) جا هەر یەكێك لەم سێ ووشانە لەكاتی گووتنی دا دەنگێكەو چوار پیتی هیجائی لەخۆ دەگرن ، بۆ نموونە: ئاماژە پێ ی ناگوترێ (كلام) لەلای نەحویەكان ، لەبەر ئەوەی دەنگێك نی یە هەندێ پیت لەخۆی بگرێ ، هەر چەندە لەلای زمانەوانیەكان پێ ی دەوترێ (كلام) لەبەر ئەوەی سوودێكی لێ وەدەست دێت.**

ومعني كونه مركباً : أن يكون مؤلفاً من كلمتين أو أكْثَرَ ، نحو :

**وە واتای كە دەڵێن (مركب) بێت: ئەوەیە كە دەبێت لە دوو ووشە یا زیاتر پێك هاتبێ ، وەك** " مُحَمَّدٌ مُسَافِرٌ " و" الْعِلْمُ نَافِعٌ " و " يَبْلُغُ الْمُجْتَهِدُ الْمَجْدَ " و " لِكلّ مُجْتَهِدٍ نَصِيبٌ " و "الْعِلْمُ خَيْرُ مَا تَسْعَى إِلَيْهِ " فكل عبارة من هذه العبارات تسمى كلاماً ، وكل عبارة منها مؤلفةٌ من كلمتين أو أكْثَرَ .

**هەر یەكێك لەم دەستەواژەو دەربڕینانە پێ ی دەوترێ (كلام) وەهەر دەربڕینێك لەمانە پێك هاتووە لە دوو ووشە یا زیاتر.**

فالكلمة الواحدة لا تسمَّي كلاماً عند النحاة إلا إذا انْضَمَّ[٢] إليها غيرها :

---

(1) **(اشارة) : ئاماژە.**

(2) **انضَمَّ : چووەپاڵ، إنضمام: چوونە پاڵ.**

سواءٌ أكان انضمام غيرها إليها حقيقةً كالأمثلة السابقة ، أم تقديراً [1] ، كما إذا قال لك قائل : مَنْ أَخُوكَ؟ فتقول : مُحَمَّدٌ ، فهذه الكلمة تُعتَبَرُ كلاماً ، لأن التَّقدِير : مُحَمَّدٌ أَخِي : فهي في التقدير عبارة مؤلَّفة من ثلاث كلمات .

**يەك ووشە پێی ناوترێ (كلام) لای نەحویەكان مەگەر ووشەی تری بخەیە پاڵ ، جا ئەم دانە پاڵە حەقیقی و بەرجەستە بێت وەكو نموونەكانی پێشوو ، یا بە تەقدیری بێت ، هەروەكو ئەگەر یەكێك پێت بڵێ (مَنْ اخوك) تۆش بڵێ ی (محمد) ئەو ووشەیە بە (كلام) دادەنرێ ، چونكە وا تەقدیر دەكرێ كە تۆ گوتوتە (محمد اخي) ئەمەش لە تەقدیردا دەربڕینێكە پێك هاتووە لە سێ ووشە:**

ومعنى كونه مفيداً : أن يَحْسُنَ سكوتُ المتَكلم عليه ، بحيث لا يبقى السَّامِعُ منتظراً لشيءٍ آخر ، فلو قلت " إِذَا حَضَرَ الأُستَاذ " لا يسمي ذلك كلاماً ، ولو أَنَّه لفظ مركب من ثلاث كلمات ؛ لأن المخاطب[2] ينتظر ما تقوله بعد هذا مِمَّا يَتَرَتَّبُ علي حضور الأستاذ . فإذا قلت : " إِذَا حَضَرَ الأُسْتَاذُ أَنْصَتَ[3] التَّلامِيذُ " صار كلاماً لحصول الفائدة .

**وە مانای كە دەبێت بەسوود بێت ئەوەیە : كە قسەكار دەوەستێ لەسەر قسەكەی وەستانەكەی جوان و بەسوود بێت بەشێوەیەك گوێگر چاوەڕوانی شتی تر نەكات بیڵێ ی ئەگەر بڵێ ی (إذا حضر الاستاذ) ئەوە پێ ی ناگوترێ (كلام) هەرچەندە قسەیەكە پێك هاتووە لەسێ ووشە ، لەبەر ئەوە قسە لەگەڵكراو چاوەڕوانی ئەوە دەكات كە چی پێ**

---

(1) تقدير : ئەندازەگیری–مەزەندە– تەخمین.

(2) مُخاطب قسە لەگەڵ كراو – دوێنراو، مُتَكَلِّم: قسەكەر

(3) انْصَتَ : بێ دەنگ بوو و گوێ ی گرت/ الإنصات: السكوتُ والإستماع.

**دەڵێ ی لەدوای ئەمە ، کە مامۆستا ئامادەدەبێت چی دەبێت! بەڵام ئەگەر گوتت (اذا حضر الأستاذُ انُصَتَ التلاميذُ) دەبێتە (کلام) لەبەر وەدەست هێنانی سوود.**

ومعني (كونه موضوعاً[١] بالوضع العربيّ) : أن تكون الألفاظ المستعملة في الكلام من الألفاظ التي وَضَعَتْهَا العربُ للدَّلالة[٢] على معني من المعاني : مثلاً " حَضَرَ " كلمة وضعها العربُ لمعنًى، وهو حصول الحضور في الزمان الماضي ، وكلمة " محمد " قد وضعها العربُ لمعنًى، وهو ذات الشخص المسمى بهذا الاسم ، فإذا قُلْتَ " حَضَرَ مُحَمَّدٌ " تكون قد استعملت كلمتين كُل منهما مما وَضعه العرب، بخلاف ما إذا تكلمْتَ بكلام مما وضعه العَجَمُ[٣] : كالفرس ، والترك ، والبربر ، والفرنج ، فإنه لا يسمى في عُرف علماءِ العربية كلاماً، وإن سمَّاهُ أهل اللغة الأخرى كلاماً.

**وە مانای ئەوەی کە دەبێ بەپێ ی یاسای زمانی عەرەبی دانرابێ: ئەوەیە دەبێ ئەو قسانەی کە بەکار هاتوون لە ناو (کلام) ەکە لەو قسانە بن کە عەرەب دایانناون بۆ ئاماژە کردن لەسەر مانایەك لە ماناکان.**

**بۆ نموونە (حضر) ووشەیەکە عەرەب دایانناوە بۆ مانایەك کە ئامادەنەبوونە لە زەمانی رابردوو ، وە ووشەی (محمد) عەرەب بۆ مانایەك داینناوە ئەوەش ئەو کەسەیە کە ناونراوە بەم ناوە ، ئەگەر گوتت (حضر محمد) ئەوە تۆ دوو ووشەت بەکارهێناوە ، هەریەکێك لەوان عەرەب داینناون ، بەپێچەوانەی ئەوەی کە ئەگەر قسە بکەی بە**

---

(1) موضوع : دانراو.

(2) دَلالة : إشارە ، ئاماژە.

(3) العَجَم : غەیری عەرەب.

**قسەیەك لەو قسانەی کە غەیری عەرەب دایناون وەك: فارس و تورکمان و بەربەرو فەرەنسیەکان ، ئەوە لە زاراوەو لێکدانەوەی زانایانی عەرەبی پێ ی ناگوترێ (کلام) هەرچەندە ئەگەر خەڵکی زمانەکانی تر ناوی لێ بنێن (کلام).**

أمثلة للكلام المستوفي الشروط :

**نموونە لەسەر ئەو (کلام) انەی کە ئەو مەرجانەی باس کرا تیایدا هەبێت.**

الْجَوُّ صَحْوٌ [١]. الْبُسْتَانُ مُثْمِرٌ . الْهِلاَلُ[٢] سَاطِعٌ . السَّمَاءِ صَافِيَةٌ . يُضِيءُ الْقَمَرُ لَيْلاً . يَنْجَحُ المُجْتَهِدُ . لاَ يُفْلِحُ الكَسُولُ . لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ[٣] . مُحَمَّدُ صَفْوَةُ الْمُرْسَلِينَ . اللهُ رَبُّنَا . محمد نَبِيُّنَا .

أمثلة للفظ المفرد : **نموونە لەسەر قسەی تاك:**

محمد[٤] . علي . إبراهيم . قامَ . مِنْ .

أمثلة للمركب الغير مفيد : **نموونە لەسەر قسە پێکەوەندراوی بێ سوود.**

مدينة الأسكندرية . عَبْدُ الله . حَضْرَمَوْتُ . لو أَنْصَفَ الناس[٥]. إذا جاءَ الشتاءُ . مَهْمَا أَخْفَي المُرَائِي . أن طَلَعَتِ الشَّمسُ .

---

**(1) الجو صحو : دونیا ساماڵە (ئاسمان ساف و بێ هەورە).**

**(2) الهلال : مانگی یەك شەوەو دوو شەوە ، کە لە دوو تێپەڕی پێ ی دەوترێ (قمر) (الهلال ساطع) واتە: مانگی یەك شەوە یا دوو شەوە دەرکەوت.**

**(3) لا إله إلا الله : هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە بێجگە لە خوا.**

**(4) مُحَمَّد : سوپاس کراو.**

**(5) لو انصف الناس : ئەگەر خەڵك بە ویژدان بوونایە و عەدل بونایە...**

# أنواع الكلام - جۆرەكانی - كلام-

وأَقْسَامُهُ ثَلاثَةٌ : اسْمٌ ، وَفِعْلٌ ، وَحَرْفٌ جَاءَ لِمَعْنًى [1] .

**واتە: بەشەكانی -كلام- سێنە : ناو ، فیعل، حەرف كە بۆمانایەك هاتووە.**

وَأقول : الألفاظُ التي كان الْعَرَبُ يَسْتَعْمِلُونَهَا في كلامِهِمْ ونُقِلَتْ إلينا عنهم ، فنحن نتكلم بها في مُحاوراتنا ودروسنا ، ونقرؤها في كُتُبِنا ، ونكتب بها إلي أهلينا وأصدقائنا ، لا يخلو واحد منها عن أن يكون واحدًا من ثلاثة أشياء : الاسم ، والفعل ، والحرف.

**وە دەڵێم: ئەو وێژەو لەفزانەی كە عەرەب بەكاریان هێناوە لەكاتی قسەكردنیان ، وە گوازراوەتەوە بۆ ئێمە ، جا ئێمە قسەی پێ دەكەین لەكاتی ووتو وێژو ئاخاوتن و دەرسەكانمان ، وە لە پەرتووكەكانمادا دەیخوێنینەوە ، وە دەینوسین بۆ كەس و كارو برادەرانمان ، هیچ شتێك لە مانە بەدەر نی یە لە سێ شتان:**

---

(1) وحرف جاء لمعنى:

حەرف پیت دوو جۆرن/ جۆری یەكەم ئەم پیتانەن كە بە (ا-ب-ت) دەست پێ دەكەن بە (ی) كۆتاییان دێت ، ئەمانە ژمارەیان (٢٩) پیتە ئەوانە پێیان دەوترێ (حروف المباني) ووشەیان لێ دروست دەكرێ، جا ئەم پیتانە نە بەتەنیاو نە لەناو ڕستەدا هیچ مانا نادەن بەدەستەوە.

جۆری دووەم: ئەو حەرف و پیتانەن وەك (مِنْ- عنْ- فِي - إلى- على) ئەم پیتانە مانایەكیان هەیە / بەڵام ئەم مانایەیان تەواو نابێت تا نەدرێنە پاڵ غەیری خۆیان ، ئەم پیتانە (حروف المعانی) یان پێ دەوترێ ، دانەریش مەبەستی ئەم جۆری دووەمەیە كە بۆ مانایەك هاتوون.

**ناو (الإسم) فرمان (الفعل) پیت (الحرف).**

أما الاسمُ في اللغة فهو : ما دلَّ[1] علي مُسَمَّى، وفي اصطلاح النحويين : كلمةٌ دَلَّتْ عَلَي معنًى في نفسها ، ولم تقترن[2] بزمان ، نحو : محمدٍ ، عليّ ، ورَجُل ، وَجَمل ،و نَهْر ، و تُفَّاحَة ، و لَيْمُونَةٌ ، وَعَصًا ، فكل واحد من هذه الألفاظ يدل علي معنى ، وليس الزمان داخلاً في معناه ، فيكون اسماً .

**ناو له زمانەوانیدا ئەوەیە : ئاماژە بێت بۆ ناو لێنراوێك .**

**وه له زاراوەی زانایانی (نحو): ووشەیەكە له خودی خۆی دا ئاماژە دەكات بە مانایەك ، وە نەشبەسترابێتەوە بە كات ، وەك : محمد– علی – رجل – جمل – نهر – تفاحە– عصا – جا هەر یەكێك لەم دەربڕینانە ئاماژەیە بۆ مانایەك كاتو زمان پەیوەندی نی یە لەگەڵ ماناكەی ، جا ئەمە كەوابوو پێی دەوترێ ناو (اسم).**

وأما ، الفعل فهو في اللغة : الْحَدَثُ ، وفي اصطلاح النحويين : كلمة دلَّتْ علي معني في نفسها ، واقترنت بأحد الأزمنة الثلاثة . التي هي الماضي ، والحال، والمستقبل . نحو " كَتَبَ " فإنه كلمةٌ دالةٌ علي معني وهو الكتابة ، وهذا المعني مقترن بالزمان الماضي ، و نحو " يَكْتُبُ " فإنه دال علي معنى . وهو الكتابة أيضاً . وهذا المعنى مقترن بالزمان الحاضر ، و نحو " اكْتُبْ " فإنه كلمة دالة علي معنى . وهو الكتابة أيضاً . وهذا المعنى مقترن بالزمان المستقبل الذي بعد زمان التكلم .

**وه فیعل مانای له زمانەوانیدا واتە : ڕووداو**

**وه مانای له زاراوە نەحویەكان : ووشەیەكە له خودی خۆیدا ئاماژە**

---

**(1) دَلَّ: نیشانی دا ، یَدلُّ: نیشان دەدات / دلیل : نیشان دەر**

**(2) اقتران : پەیوەندی پێوە بوون ، ولم یقترن : نەبەستراوە.**

**دەكات بە مانايەك ، وە بەسترايتەوە بەيەكێك لەم سێ كاتانە : رابردوو، ئێستا ، دواڕۆژ.**

**وەك: (كَتَبَ) ووشـەيەكە ئاماژەيە بۆ مانايەك كە نووسينە ، وە ئەمانەيەش بەستراوەتەوە بە زەمانی رابردوو.**

**وە وەك (يكتبُ) ووشەيەكە مانايەك نيشان دەدات كە نووسينە ئەو مانايەش بەستراوەتەوە بە كاتی ئێستا.**

**وە وەك: (أكتُبْ) ووشـەيەكە مانايەك دەگەيەنێ كە نووسينە ، ئەو مانايەش بەستراوە بە دواڕۆژ واتە دوای كاتی قسەكردن.**

ومثل هذه الألفاظ نَصَرَ وَ يَنْصُرُ وَانْصُرْ ،وَ فَهِمَ وَيَفْهَمُ وَ افْهَمْ ، وَعَلِمَ وَيَعْلَمُ وَاعْلَمْ ،وَ جَلَسَ وَ يَجِلسُ وَاجْلِسْ ،وَ ضَرَبَ وَ يَضْ رِبُ وَاضْرِبْ .

والفعل على ثلاثة أنواع :

**فيعل سێ جۆری هەيە:**

١ - ماضٍ ٢ -مُضَارِعٌ ٣ -أمر :

فالماضي ما دَلّ على حَدَثٍ وَقَعَ في الزَّمَانِ الذي قبل زمان التكلُّمِ ، نحو

**فەرمانی رابردوو رووداوێك نيشان دەدات كە ئەم رووداوە رووی داوە پێش كاتی قسەكردن وەك:**

كَتَبَ ، وَ فَهِمَ ، وَ خَرَجَ ، وَسَمِعَ ، وَأَبْصَرَ ، وَتَكَلَّمَ ، وَاسْتَغْفَرَ ، وَاشْتَرَكَ.

والمضارع : مَا دَلَّ عَلَى حدثٍ يقع في زمان التكلُّم أو بعده ، نحو

**فەرمانی رانەبردوو : ئەوەيە ئاماژە بۆ رووداوێك دەكات كە روودەدات لەكاتی قسەكردن ، يا لەدوای قسەكردن وەك:**

يَكْتُبُ ، يَفْهَمُ ، يَخْرُجُ ، يَسْمَعُ ، يَنْصُرُ ، يَتَكلمُ ، يَسِتَغْفِرُ ، يَشْتَرِكُ.

وَالأمرُ : ما دَلَّ علي حَدَثٍ يُطْلَبُ حُصوله بعد زمان التكلُّم ، نحو

**فەرمانى ئەمر: ئاماژە بەرووداوێك دەكات كە داوادەكرێت بەدەست بهێنرێ و جێ بەجێ بكرێ لەدواى كاتى قسەكردن وەك:**

اكْتُبْ ، افْهَمْ ، اخْرُجْ ، اسْمَعْ ، انْصُرْ ، تَكَلَّمْ ، اسْتَغْفِرْ ، إِشْتَرِكْ .

وأما الحرف : فهو في اللغة الطَرَفُ [١]

وفي اصطلاح النُحَاة : كلمة دَلَّتْ علي مَعْنًى في غيرها ، نحو " مِنْ " ، فإنَّ هذا اللفظ كلمة دلَّتْ علي معنى. وهو الابتداءُ. وهذا المعنى لا يتمُّ حتَّى تَضمَّ إلي هذه الكلمة غيرَهَا ، فتقول : " ذَهَبْتُ مِنَ الْبَيْت " مثلاً .

**وە حەرف لە زمانەوانیدا واتە: قەراخ**

**وە لەزاراوەى نەحويەكان : ووشەيەكە ئاماژە بۆ مانايەك دەكات لە غەيرى خۆى ، وەك (مِنْ) ئەو لەفزە ووشەيەكە مانايەك نيشان دەدات – كە دەست پێكردنە– وە ئەو مانايەش تەواو نابێت تا ووشەيەكى تر نەخرێتە پاڵى بۆ نموونە بڵێ ى (ذهبتُ مِنَ البيتِ).**

أمثلة للاسم : كتابٌ ، قَلَمٌ ، دَوَاةٌ[٢] ، كرَّاسَةٌ [٣] ، جَرِيدَةٌ ، خليل ، صالح، عمران ، وَرَقَةٌ ، سَبُعٌ [٤] ، حمَارٌ ، ذِئْبٌ ، فَهْدٌ[٥] ، نَمِرٌ ، لَيْمُونَة ، بُرْتقَالَةٌ ،

---

**(1) طرف– لێوار– كەنار– قەراخ.**

**(2) دواة– محبرة: شووشەى مەرەكەب**

**(3) كُراسة– ناميلكە – كُتێب.**

**(4) سَبُع– دڕندە.**

**(5) فهد– جۆرە دڕندەيەكە.**

كُمَّثْرَاةٌ [1] ، نَرْجِسَةٌ ، وَرْدَةٌ ، هَؤلاءِ ، أنتم .

أمثلة للفعل : سافَرَ يُسَافِرُ سَافِرْ ، قالَ يَقُولُ قُلْ ، أَمِنَ يَأْمَنُ إِيمَنْ ، رَضِيَ يَرْضَي ارْضَ ، صَدَقَ يَصْدُقُ اصْدُقْ ، اجْتَهَدَ يَجْتَهِدُ اجْتَهِدْ ، اسْتَغْفَرَ يَسْتَغْفِرُ اسْتَغْفِرْ .

أمثلة للحرف : مِنْ ، إلي ، عَنْ ، عَلَي ، إلا ، لكِنْ ، إنَّ ، أَنْ ، بَلي ، بَلْ ، قَدْ ، سَوْفَ ، حَتَّى ، لَمْ ، لا ، لَنْ ، لَوْ ، لَمَّا ، لعَلَّ ، مَا، لاَتَ ، لَيْت ، إنْ ، ثُمَّ ، أَوْ .

---

(1) كُمَّثراة- هەرمێ

## علامات الاسم - نيشانەكانی ناو

قال : فالاسم يُعْرَفُ بـ ١ -الْخَفْض[١]، وَ ٢ - التَّنْوِينِ[٢]، وَ ٣ - دخولِ الألِفِ وَالَّلامِ ، وَ ٤ -حُرُوف الْخَفْضِ ، وَهيَ : مِنْ ، وَإلي ، وَعَنْ ، وَعَلَى ، وَفي ، وَرُبَّ ، والْبَاءُ ، والْكافُ ، وَالَّلامُ ، وحُرُوفُ القَسَمِ ، وهِيَ : الْوَاوُ ، والْبَاءُ ، والتَّاءُ .

**دانەر دەڵێ : ناو دەناسرێتەوە بە :**

**١- كەسرە ، یا جێگرەكەی.**

**٢- مینگە (تنوین).**

**٣- چوونە سەری (أل) ی ناساندن.**

**٤- چوونەسەری حەرفی جەر كە ئەمانەن:**

**(مِنْ) - إلی - عَن- علی - في - ربَّ - الباء - الكاف - اللام) وە پیتەكانی سوێند خواردن كە بریتین لە : (واو - باء - تاء).**

وأقول : للاسمِ علامات يتميَّز عن أخَوَيْه الفِعْلِ والْحَرْفِ بوجود واحدةٍ منها أو

---

**(1) خفض- هاتنە خوار- نزم بوون، بەسرابییەكان بە (خفض) یان گوتووە (جَرّ) بەڵام كوفیەكان گووتویانە(خفض) هەردووكیان یەك شتن تەنها ناوەكانیان جیان.**

**(2) تنوین- نونێكی سكون دارە دەكەوێتە كۆتایی ناوە نەناسراوەكان بە شێوەی دوو فەتحە یا دوو كسرە یا دوو بۆر (ضَمَّة) دەنوسرێت.**

قَبُولِها ، وقد ذَكر المؤلف . رحمه الله ! . من هذه العلامات أَرْبَعَ علاماتٍ ، وهي: ١ - الْخَفْضُ ، و ٢- التَّنْوِينُ و ٣- دخولُ الالف والّلام ، و ٤- دُخول حرفٍ من حروف الخفض .

**وه دەڵێم : بۆناو هەیە چەند نیشانەیەك پیٚ ی جیادەكریٚتەوە لە براكانی كە (فیعل و حەرفە) بەوەی كە یەكیٚكی لەم نیشانانە لەسەر بیٚت یا ئەگەر لەسەریشی نەبیٚت قەبولی بكات، جا دانەر چوار نیشانەی باس كردووە كە ئەمانەن:**

**١- الخفض.**

**٢- التنوین.**

**٣- (أل) ی ناساندن.**

**٤ - چونەسەری یەكیٚك لە پیتەكانی (خفض) یا (جّر)**

أما الخفض فهو في اللغة : ضد الارتفاع ، وفي اصطلاح النحاة عبارة عن الكسرة التي يُحْدِثُهَا الْعاملُ[1]، أوْ ما ناب عنها ، وذلك مثل كسرة الراءِ من " بكرٍ " و "عمرو " في نحو قولك : " مَرَرْتُ بِبَكْرٍ " وقولك " هذا كِتابُ عَمْرِو " فبكْرٍ وعمرٍو: اسمان لوجود الكسرة في أواخر كل واحِدٍ منهما .

**١ - (خفض) لەزمانەوانی: دژی بەرزبوونەوەیە ، واتە: نزم بوون، بەڵام لە لیٚكدانەوەی زانایانی نەحوی بریتیە لە كەسرەیەك یا لە جیٚگری كەسرە كە عامیلیٚك دروستی دەكات، وەك كەسرەی پیتی (راء) لە (بكرٍ)**

---

(1) **العامل: -كاركەر- پاڵنەر، بۆ نموونەكە دەڵیٚ ی (مررت ببكرٍ) (بكر) كە لیٚرە كەسرەی هەیە بەهۆی پیتی (باء) ەكەیە كە چووەتە سەری ، جا ئەم پیتی (باء)ە لیٚرەدا واتە (باء) ی یەكەم پیٚ ی دەگوتریٚ (عامل).**

**وە (عَمْرو) وەك ئەم رستەیە (مَرَرْتُ بِبكرٍ) وە وەك (هذا كتابُ عَمْرٍو) جا (بكر) وە (عمرو) دوو ناون ، لەبەر ئەوەی لە كۆتایی هەر یەكێكیان كەسرە هەیە.**

وأما التنوين ، فهو في اللغة التَّصْويت ، تقول " نَوَّنَ الطَّائِرُ " أي : صَوَّتَ .

وفي اصطلاح النُّحَاة هو : نُونٌ ساكنةٌ تَتْبَعُ آخِرَ الاسم لفظاً وتفارقهُ خَطا للاستغناء[1] عنها بتكرار الشَّكلة عند الضبْطِ بالقلم ، نحو : محمدٍ ، وكتابٍ ، وإيهٍ ، وصَهٍ ، ومُسْلِمَاتٍ ، وفَاطِمَاتٍ ،و حِينَئِذٍ ،وَ سَاعَتَئِذٍ ، فهذه الكلمات كلها أسماءٌ ، بدليل وجود التنوين في آخرِ كلِّ كلمة منها.

**٢- تەنوین لە زمانەوانیدا واتە: دەنگدان ، دەنگ لێوەهاتن دەڵێ (نَوَّنَ الطائر) واتە: باڵندەكە دەنگی لێوە دەرچوو.**

**وە لەزاراوەدا بریتیە لەنونێكی سكوندار دەكەوێتە كۆتایی ناو بەقسە دەخوێندرێتەوە ، وە بە نووسین نانووسرێ بۆ بێ پێویست بوونمان لە نووسینی ئەم تەنوینە بەشێوەی نون ئەوە حەرەكەكە دووجار دووبارە دەكەیەوە لەكاتی نووسین بە قەلەم ، (واتە ئەگەر یەك فەتحە بیت بە دوو فەتحە دەینوسین، ئەگەر یەك كەسرە بێت بەدوو دەینوسین ، ئەگەر یەك بۆر بێت بە دوو بۆر دەینوسین بۆ ئەوەی پێویستیمان بە نووسینی نونەكە نەبێت).**

(1) إستغناء: بێ پێویست بوون.

**وەك : (محمدٍ- كتابٍ- إيهٍ[1] – صهٍ[2] – مسلماتٍ- حينئذٍ- ساعَتَئذٍ) ئەم ووشانە هەمووی ناون ، بەبەڵگەی بوونی تەنوین لە کۆتایی هەموو ووشەیەك لە ووشەکان.**

العلامة الثالثة من علامات الاسم : دخول " أَلْ " في أول الكلمة ، نحو " الرجل ، و : الغلام[3] ، و: الفرس ،و: الكتاب ، و:البيت ، و: المدرسة " فهذه الكلمات ، كلها أسماء لدخول الألف واللام في أوَّلها .

**نیشانەی سێ یەم لە نیشانەکانی ناو چونە سەری (أل) ی ناساندنە لە سەرەتای ووشەکە وەك (الرجل – الغلام – الفرس[4] – الکتاب – البیت – المدرسة).**

**ئەو ووشانە هەموویان ناون لەبەر ئەوەی (أل) ناساندن چووەتە سەر سەرەتای ووشەکە.**

العلامة الرابعة : دخول حرفٍ من حروف الخفض ، نحو " ذهبتُ من البيت إلي

---

(1) **إيهٍ: ئیسمی فیعلی ئەمرە، واتە: داوای زیاتر کردن، لە کوردیشدا کاتێك یەکێك قسەیەکت بۆ دەکات تۆش دەڵێ ی (ئێی) واتە ئەوانی تریش، ئێ لەدوای ئەوە چی تریش.**

(2) **صَه: فیعلی ئەمرە ، واتە (اُسکُتْ) بێ دەنگ بە.**

(3) **الغلام: منداڵ لەو کاتەی کە لەدایك دەبێت تا ئەو کاتەی کە بالغ دەبێت پێ ی دەوترێ (غلام).**

(4) **الفرس: ئەسپ و ماین / ئەسپ نێرەکەیە / ماین مێیەکەیە / وە (بَغل) واتە: هێستر، هێستر باوکی نێرەکەرە دایکی ماینە / پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:**

**لەئێستریان پرسی باوکی تۆ کێ یە      ووتی رەسەنی دایکم پێ یە**

**خۆزگە ئەو کەسەی بە زۆڵ دەرچووە      ئەویش وەك ئێستر بەری نەئەبوو**

المدرسَةِ " فكل من " البيت " و " المدرسة " اسم ، لدخول حرف الخفض عليهما ، ولوجود " أَلْ " في أَوَّلهما .

وحروف الخفض هي :

**نیشانەی چوارەم (لە نیشانەکانی ناو) ئەوەیە کە یەکێك لە حەرفەکانی جەری بچێتە سەر وەك (ذهبت من البیت إلی المدرسة) جا هەر یەکێك لە ووشەی (البیت) وە (المدرسة) ناون لەبەر ئەوەی حەرفی خەفزیان چووەتە سەر وەلەبەر بوونی (أل) ی ناساندنیش لە سەرەتاکانیان وە پیتەکانی (خفض) ئەمانەن:**

١ - (مِنْ) **چەند مانایەکی هەیە لەوانە** (الإبتداء) **دەست پێ کردن ، وەك** (سَافَرتُ مِنَ الْقَاهِرَةِ).

٢ - (إلى) **لە مانایەکانی** (الإنتهاء) **کۆتایی هاتن، وەك**(سَافَرْتُ إلي الإِسْكَنْدَرِيَّةِ).

٣ - (عَنْ) **لە مانایەکانی** (المجاوزةُ) **تێپەڕبوون ، وەك** (رَمَيْتُ السَّهْمَ عَنِ الْقَوْسِ).

٤ - (على) **لە مانایەکانی** (الاستعلاءُ) **بەرزبوونەوە ، وەك** (صَعِدْتُ عَلَي الْجَبَلْ).

٥ -(فِي) **لە مانایەکانی**(الظرفية) **لەناودابوون ، وەك** (الْمَاءُ في الْكُوز) [1].

٦ -(رُب ) **لە مانایەکانی** (التقليل) **کەمکردن،وەك** (رُبَّ رَجُلٍ كرِيمٍ قَابَلَنِي)[2].

٧ -(الْبَاءُ) لة **مانایەکانی** (التعدية) **تێپەڕبوون، وەك** (مَرَرْتُ بالْوَادِي).

---

(1)**کوز: کۆیەکەی (کیزان)ە ، إناء کالإبریق لکنە أصغر منە – قاپێکە وەك مەسینە بەڵام لەئەو گچکەتر.**

(2)(**رب رجل کریم قابلني) کەم پیاوی بەخشندە بەمن گەیشتوون.**

٨ - (الكافُ) **له مانایەکانی** (التشبیه) **پیٚ چواندن، وەك** (لَيْلي كالْبَدْرِ) [(١)].

٩ - (الباء) **له مانایەکانی** :

أ - (الْمِلْكُ) **خاوەنایەتی وەك** (المالُ لمحمد).

ب - (الاختصاصُ) **تایبەتمەندیەتی، وەك** (البابُ للدَّار) **وە** (الْحَصيرُ لِلْمَسْجِدِ)

ج - (الاستحقاقُ) **شایەن بوون** ، وةك (الْحَمْدُ لله).

**وە لە پیتەکانی** (خفض) **پیتەکانی سوێند خواردن کە سیٚ پیتن:**

**یەکەم** : (الواو): **ئەوە تەنها دەچێتە سەر ناوی ئاشکرا، وەك (واللهِ) وە وەك** ﴿ وَالطُّورِ ۝١ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ ۝٢ ﴾

**وە وەك** ﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ ﴾

**دووەم: (الباء) ئەم پیتە تایبەت نی یە بە دەربڕینێك جگە لە یەکێکی تر بەڵکو دەچێتە سەر ناوی ئاشکرا وەك (باللهِ لَاجتهدنَّ) وە دەچێتە سەر راناویش (الضمیر) وەك (بِك لأضربَنَّ الكسول)** [(٢)].

**سیٚ یەم: (التاء)ئەمە تەنها دەچێتە سەر ناوی خوا وەك:** ﴿ وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ ﴾[(٣)].

---

(1)(البدر) مانگی چواردە.

(2) (بِك لأضربَنَّ الكسول) واتە: سوێند بەتۆ (واتە بەخوا) لە تەمبەڵ دەدەم.

(3) (الأنبياء–٥٧) ﴿ وَتَاللَّهِ ﴾ الواو: حرف عطف، التاء: حرف جر وقسم، لفظ الجلالة : اسم مجرور بالكسرة.

# علامات الفعل[1]. نیشانەکانی فیعل

| |
|---|
| قال : والفِعْلُ يُعْرَفُ بِقَدْ ، وَالسينِ و" سَوْفَ " وَتَاءِ التأْنيثِ السَّاكِنة |

وأقول : يَتَميز الفعْلُ عن أَخَوَيْهِ الاسمِ وَالْحرفِ بأَرْبعِ علاماتٍ ، متى وَجَدْت فيه واحدةً منها ، أو رأيتَ أنه يقبلها عَرَفْتَ أَنَّه فعلٌ :

الأولي : قد والثانية " السين " والثالثة : " سوف " والرابعة تاءُ التأْنيث الساكنة .

**دانەر دەڵێ : فیعل دەناسرێ بە وەرگرتن و چوونەسەری (قَدْ) و (سین) و (سوف) و (تائی سکونداری مێ).**

**وە دەڵێم: فیعل جیادەکرێتەوە لە دوو براکەی (إسم) و (حەرف) بەچوار نیشانە هەر کاتێك بینیت یەکێك لەمانەی تیادابوو یا بینیت وەری دەگرێ ، ئەوە دەزانی کە ئەمە فیعلە.**

**یەکەم: قَدْ**

**دووەم: سین**

**سێ یەم: سوف**

**چوارەم : تائی سکونداری مێ**

أما " قد ": فتدخل على نوعين من الفعل ، وهما : الماضي ، والمضارع .

فإذا دخلت على الفعل الماضي دلَّتْ علي أحد مَعْنَيَيْن . وهما التحقيق و

---

**(1) علامات الفعل/(علامات) کۆیە، تاکەکەی (علامە) یە ، واتە: نیشانە ، (الفعل) واتە : کردار ، کردەوە، لە رێزمانی کوردی ووشەی (فرمان)ی بۆ بەکاردێت..**

التقريب . فمثالُ دلالتها علي التحقيق قولُه تعالي: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ وقولُه جل شأُنه: ﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ وقولنا : " قَدْ حَضَر مُحَمَّدٌ" وقولنا : " قد سافَرَ خَالِدٌ " و مثالُ دلالتها على التقريب قولُ مُقيم الصلاة : " قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ " و قولك : " قَدْ غَرَبَت الشَّمْسِ".

**حەرفی (قَدْ) دەچێتە سەر دوو جۆر لە فیعل (الماضي) وە (المضارع) ئەگەر چووە سەر فیعلی (ماضي) ئەوە یەك لە دوو مانایان دەگەیەنێ :**

**١- (التحقيق) [١] واتە: (تاكيد) ٢- (التقريب) واتە : نزيك بوونەوە.**

**نموونە لەسەر مانای (قَدْ) بۆ (تحقيق) خوا دەفەرموێ ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾[٢] وە خوا دەفەرموێ ﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾[٣]، وە كە دەڵێن (قد حضر محمد) وە (قد سافرَ خالدُ) [ قد:حرف تحقيق (سافر) فعل ماضي (خالد) فاعل مرفوع بالضمة] وە نموونەشی لەسەر (تقريب) نزيكبوونەوە/ قسەی ئەوەی كە قامەت دەكات دەڵێ(قد قامت الصلاةُ) وە (قد غربتِ الشمسُ) [٤] [ قد: حرف تقريب (غربتِ) فعل ماضي مبني على الفتح (التاء) للتأنيث وقد كُسِّر لإلتقاء الساكنين**

---

(1) تحقيق: واتە: توكيد، يا تأكيد، كە هەردووكيان، يەك مانايان هەيە، لە كوردی ووشەی بێگومان يان بەڕاستی لەبەرامبەری دادەنێ ی، تۆ كاتێك ووشەی (قد) بۆ (تحقيق) بەكار دەهێنێت كە بەرامبەرەكەت گومانی هەيە لە خەبەرەكە ، يا مەرج وانی يە گومانی هەبێت تەنها بۆ بەهێز كردنی قسەكەت بەكاری دەينی.

(2) (المؤمنون-١) واتە: بەراستی باوەڕداران رزگاربوون (سەركەوتن). .

(3) (الفتح-١٨) واتە : سوێند بەخوا بێگومان خوا رازی بوو لەو ئيماندارانەی

(4) ئەمە لێرەدا بۆ ئەو كاتەيە كە رۆژ نزيكی ئاوابوونە.

(الشمس) فاعل] .

وإذا دخلتْ على الفعل المضارع دلَّتْ علي أحدِ مَعْنَيَيْن أيضاً . وهما التقليل ، والتكثير . فأما دلالتها على التقليل، فنحو قولك: (قَدْ يَصْدُقُ الكَذُوبُ) و قولك: (قَدْ يَجُودُ الْبَخِيلُ) و قولك: (قَدْ يَنْجَحُ الْبَلِيدُ) .

وأما دلالتها على التكثير ؛ فنحو قولك: (قَدْ يَنَالُ الْمُجْتَهِدُ بُغْيَتَه) وقولك: (قَدْ يَفْعَلُ التَّقِيُّ الْخيْرَ) وقول الشاعر :

قَدْ يُدْرِكُ الْمُتَأَنِّي بَعْضَ حَاجَتِهِ وَقَدْ يَكُونُ مَعَ الْمُسْتَعْجِلِ الزَّلَلُ

**وه ئەگەر (قد) چووه سەر فیعل (مضارع) ئەوه ئاماژه بۆ یەك له دوو مانایان دەكات كه ئەمانەن: (التقليل) كەم كردن، وه (التكثير) زۆركردن، (قد) لەو كاتەی مانای كەم كردن بگەیەنێ وەك (قَدْ يَصْدُقُ الكَذُوبُ) وه (قَدْ يَجُودُ الْبَخِيلُ) وه: (قَدْ يَنْجَحُ الْبَلِيدُ)[1].**

**وه قەد لەوكاتەی مانای زۆركردن بداتەوه وەك (قَدْ يَنَالُ الْمُجْتَهِدُ بُغْيَتَه) وة: (قَدْ يَفْعَلُ التَّقِيُّ الْخيْرَ) وه وەك شاعیر دەڵێ:**

**قَدْ يُدْرِكُ الْمُتَأَنِّي بَعْضَ حَاجَتِهِ وَقَدْ يَكُونُ مَعَ الْمُسْتَعْجِلِ الزَّلَلُ[2].**

(1) قد ينجحُ البليدُ: جاری وا هەیه ئینسانی زەین كۆریش ناجح دەبێت.

(2) زۆر جار وا هەیه كه ئەوانەی پەله ناكەن دەگەن بە هەندێ لە داواو پێداویستیەكانیان ، وه زۆر جاریش لەگەڵ پەلەكردن خلیسكان روودەدا..

وأما السين وسوف : فيدخلان علي الفعل المضارع وَحْدَهُ ، وهما يدلان على التنفيس ، ومعناه الاستقبال ، إلاّ أنّ " السين " أقَلُّ استقبالاً من " سوف" . فأما السين فنحو قوله تعالي :

﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ ، ﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ ﴾

وأما " سوف " فنحو قوله تعالي : ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾ ، ﴿ سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا ﴾ ، ﴿ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ ﴾

**وە (سين) و (سوف) تەنها دەچنە سەر فيعلى (مضارع) هەر دووكيان ماناى دواڕۆژ دەدەنەوە، بەلأم (سين) ماناى دواڕۆژى كەمترى تێدايە لە (سوف).**

**نموونە لەسەر (سين) وەك خوا دەفەرموێ:**

**﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾[١]. وە﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ ﴾[٢] .[السين: حرف استقبال (يقولُ) فعل مضارع] وە نموونە لەسەر (سوف) وەك خوا دەفەرموێ ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾[٣]. وە ﴿ سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا ﴾[٤]. وە ﴿ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ ﴾[٥].**

---

(1) **(البقرة -١٤٢) لەمەودوا خەڵكى گەوج و نەفام دەڵێن.**

(2) **(الفتح-١١) لەمەودوا بەجێ ماوان پێت دەڵێن.**

(3) **(الضحى-٥) واتە: سوێند بە خوا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ كە رازى بێت.**

(4) **(النساء-٥٦) واتە : لەمەودوا دەيانخەينە ناو ئاگرێك.**

(5) **(النساء-١٥٢) واتە: لە داهاتوودا خوا پاداشتتان دەداتەوە لە ئيعرابى(سوف) دەڵێى : حرف استقبال.**

أما تاءُ التأْنيث الساكنة : فتدخل على الفعل الماضي دون غيره ؛ والغرض منها الدلالة علي أنَّ الاسْمَ الذي أُسند هذا الفعلُ إليه مؤنَّثٌ ؛ سواءٌ أكان فاعلاً ، نحو " قَالَتْ عَائِشَةُ أُمُّ الْمُؤمِنِينَ " أم كان نائبَ فاعل ، نحو (فُرِشَتْ دَارُنَا بِالْبُسُطِ).

والمراد أنها ساكنة في أصل وَضْعها ؛ فلا يضر تحريكها لعارض التخلص من التقاء الساكنين في نحو قوله تعالى : ﴿ وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ﴾ ، ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ ﴾ ، ﴿ قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴾.

**وه تای مێی سكوندار تەنها دەچێتە سەر فیعل (ماضي) وە ئامانجیش لە خستنە سەری ئەم تایە بۆ سەر فیعلی (ماضي) ئاماژەیە بۆ ئەوە كە ئەو ناوەی ئەم فیعلەی دراوەتە پاڵ ناوێكی مێ یە ، جا جیاوازی نی یە.**

**١- ناوەكە فاعل بێت وەك (قالت عائشةُ أُمّ المؤمنين)[1].**

**٢- یا (نائب فاعل) جێگری فاعل بێت وەك (فُرِشت دارنا بالبُسطِ)[2].**

**واتە:ماڵەكەمان فەرش ڕێژ كرا، مەبەستمان لە تای سكونداری مێ ئەوەیە كە لە بنەڕەتدا سكون دارە، جا زیانی نی یە كە ئەگەر ئەم تایە**

---

(1) قالَتْ: قالَ : فعل ماضي مبني على الفتح والتاء للتأنيث.

عائشةُ: فاعل مرفوع بالضمة (أمُّ) عطف بيان (المؤمنين) مضاف اليه.

(2) فُرشت: فعل ماضي مبني للمجهول مبني على الفتح ، والتاء للتأنيث .

دارُنا: دارُ: نائب فاعل مرفوع بالضمة وهو مضاف (نا) مضاف إليه.

حەرەکەدار کرا لەبەر بەیەککەیشتنی دوو پیتی سکون دار وەك خوا دەفەرموێ ﴿ وَقَالَتِ اَخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ﴾ (یوسف-٣١)، ﴿ إِذْ قَالَتِ اَمْرَأَتُ عِمْرَانَ ﴾ (آل عمران -٣٥)، . ﴿ قَالَتَآ[1] أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴾ (فصلت -١١).

ومما تقدم يتبين لك أن علامات الفعل التي ذكرها المؤلف علي ثلاثة أقسام:

وە لەوەی ڕابردوو بۆت ڕوون دەبێتەوە کە نیشانەکانی فیعل ئەوەی کە دانەر باسی کرد سێ بەشن:

١- بەشێکیان تایبەتە بە چوونەسەر فیعلی (ماضي) کە ئەمەش تای مێ ی سکونداره (تاء التأنيث الساكنة).

٢ - بەشێکیان تایبەتە بە چوونە سەر فیعلی (مضارع) کە ئەویش (سين) و (سوف) یە.

٣- وە بەشێکیان بەشدارە لە نێوانی هەردووکیان کە (قدْ) ە .

وە دانەر نیشانەی فیعلی ئەمری باس نەکردووە ، ئەویش ئەوەیە کە مانای داخوازی (طلب) بگەیەنێ ، لەگەڵ قەبوڵکردن و وەرگرتنی یائی مێ ی قسە لەگەڵ کراو (ياء المخاطبة) وە هەروەها نونی تەوکید وەك

---

(1) قالَتاْ: قالَ: فعل ماضي مبني على الفتح ، والتاء للتأنيث، والألف : ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل .

کەواتە (تاء) کە لێرە فەتحەی وەرگرتووە لەبەر ئەوەیە ئەلیفی لەدوادا هاتووە ئەلیفیش بەردەوام پیتەکەی پێشی فەتحە دارە ، کەواتە (تاء) کە لێرە فەتحە دارە لەبەر (مناسبە)یە.

(قم) (اُقعدْ) (اُكتبْ) (اُنظرْ) ئەو چوار ووشانە ماناى داخوازى بەدەست هێنانى هەستان و دانیشتن و نووسین و تەماشاكردن دەكەن ، لەگەڵ وەرگرتن و قەبوڵكردنى(یاء المخاطبة) وەك (قومِي) (اُقْعُدي) یا لەگەڵ قەبوڵكردن و وەرگرتنى نونى توكید وەك (اُكْتُبَنَّ) وە (اُنْظُرَنَّ إلى ما یَنفعكَ) [1]

---

(1) واتە: تەماشاى ئەوە بكە كە سوودت پێ دەگەیەنێ (اُنظرنَّ) فعل أمر مبني على الفتح لإتصاله بنون التوكيد الثقيلة ، والفاعل ضمير مستتر تقديره أنت، ونون التوكيد الثقيلة لا محل لها من الإعراب.

# الحرف - پيت

قال : و الْحَرْفُ مَالاَ يِصْلُحُ مَعَهُ دَلِيلُ الاِسْمِ وَلاَ دَلِيلُ الْفِعْل .

**واته: حەرف پيت بەوە دەناسرێنەوە كە ناگونجێ نيشانەكانى ناوو فيعل وەربگرن و قەبول بكەن.**

و أقول : يتميّز الحرف عن أَخَوَيْهِ الاسمِ والفعلِ بأنه لا يصح دخول علامة من علامات الأسماءِ المتقدمة ولا غيرها عليه ، كما لا يصح دخولُ علامة من علامات الأفعال التي سبق بيانُها ولا غيرها عليه ، و مثلُه " مِنْ " و " هَلْ" و" لَمْ " هذه الكلمات الثلاثة حروفٌ ، لأنها لا تقبل "أَلْ" و لا التنوين ، ولا يجوز دخول حروف الخفض عليها ، فلا يصح أن تقول : المِنْ ، لا أن تقول: منٌ ، ولا أن تقول : إلي مِنْ ، وكذلك بقية الحروف ، وأيضاً لا يصح أن تدخل عليها السينُ ، ولا " سوف " ولا تاءُ التأنيثِ الساكِنةُ، ولا "قَدْ" ولا غيرها مما هو علاماتٌ علي أن الكلمة فِعلٌ .

**وە دەڵێم: حەرف جيا دەكرێتەوە لەدوو براكەى (اسم) و(فيعل) بەوەى كە نابێ و ناگونجێ نيشانەيەك لە نيشانەكانى پێشووى (اسم) و غەيرى ئەوانيش بچێتە سەرى ، هەروەكو ناشگونجێ و درووست نى يە كە يەكێك لە نيشانەكانى فيعلى بچێتە سەر كە پێشتر باسمان كرد وە نموونە لەسەر ئەوە (مِنْ) (هَلْ) وە (لَمْ) ئەم سێ ووشەيە حەرفن لەبەر ئەوە (ال) ى ناساندن وەرناگرن، وە هەروەها تەنوينيش ، وە دروستيش نى يە پيتەكانى جەڕيان بچێتەسەر.**

دروست نییه بڵێ ی (المِنْ) وه بڵێ ی (مِنّ) وه بڵێ ی (إلى مِنْ) وه بهم شێوهیهش پیتهکانی تریش.

وه ههروهها دروست نی یه (سین) و (سوف) هیان بچێتهسهر ، وه ههروهها (تائی سکون داری مێ) و (قَدْ) وه غهیری ئهوانهش که نیشانهن لهسهر ئهوهی که ئهم ووشه فیعله.

## باب الإعراب / باسی گۆڕانی کۆتاییەکانی ووشە.

قال : الإعْرَابُ هُوَ : تَغْيِيرُ أَوَاخِرِ الْكَلِمِ لاِخْتِلاَفِ الْعَوَامِلِ الْداخِلَة عَلَيهَا لَفْظاً أَوْ تَقْدِيراً .

**دانەر دەڵێ (إعراب) بریتیە لە گۆڕانی کۆتاییەکانی ووشە بەهۆی جیاوازی ئەو عامیلانەی کە دەچنە سەری**

و أقول الإعراب له مَعْنَيَانِ : أحدهما لُغويٌّ ، و الآخر اصطلاحيٌّ

أما معناه في اللغة فهو : الإظهار و الإبانة ، تقول : أَعْرَبْتُ عَمَّا فِي نَفْسِي ، إذا أَبَنْتَهُ وأَظْهَرْتَهُ.

و أما معناه في الاصطلاح فهو ما ذكره المؤلف بقوله : ( تَغْيِيرُ أوَاخِرِ الكَلِمِ إلخ ).

**وە دەڵێم : (إعراب) دوو مانای هەیە یەکیان لە زمانەوانیدا / ئەوەی تریان لە زاراوەدا.**

**مانای لە زمانەوانیدا واتە: ئاشکرابوون و روون بوونەوە ، دەڵێ ی (اعربت عما في نفسي) ئەگەر ئەوەی لەناو دڵت دایە روونی بکەیتەوەو ئاشکرای بکەی.**

**وە مانای لە زاراوەدا : ئەوە دانەر باسی کردووە کە دەڵێ (گۆڕانی کۆتاییەکانی ووشەیە...)**

والمقصود من " تَغْيِـير أَوَاخِرِ الْكَلِم " تَغْيِير أَحْوَالِ أَوَاخِر الكلم ، ولا يُعْقَل أن يُرَادَ تغييرُ نفس الأوَاخِرِ، فإنَّ آخِر الكلمة نَفْسَهُ لا يتغير ، وتغيير أحوال أواخِر الكلمة عبارة عن تحوُّلها من الرفع إلي النصب أو الجر : حقيقة ، أو حُكماً ،

ويكون هذا التَّحَوُّل بسبب تغيير العوامل : من عامل يقتضي الرفع على الفاعلية أو نحوها ، إلي أخرَ يقتضي النصبَ على المفعولية أو نحوها ، وهلم جرا .

مثلاً إذا قلت: " حَضَرَ مُحَمَّدٌ " فمحمد : مرفوع ؛ لأنه معمول لعامل يقتضي الرفع على الفاعلية ، وهذا ا لعامل هو " حضر " ، فإن قلت : " رأيت محمداً " تغير حال آخر " محمد " إلي النصب ؛ لتغير العامل بعامل آخر يقتضي النصبَ وهو " رأيت " ، فإذا قلت " حظيتُ بمحمدٍ " تغير حالُ آخره إلي الجر ؛ لتغير العامل بعامل آخر يقتضي الجر وهو الباء .

**مەبەست لە (گۆڕانی کۆتاییە کانی ووشە) بریتیە لە گۆڕانی باری کۆتاییەکانی ووشە ناگونجێ لێرەدا مەبەست گۆڕانی خودی پیتەکانی کۆتایی بێت ، چونکە کۆتایی ووشە لەخودی خۆیدا ناگۆڕێ ، گۆڕانی کۆتایی یەکانی ووشە بریتیە لە گۆڕانی لە ڕەفع بۆ نەسب یا بۆ جەڕ ، جا چ بە حەقیقی و بەرجەستە بێت یا بە مەزمەندەو تەخمین بێت .**

**وە ئەم گۆڕانکارییەش بەهۆی (عامل) ە کانەوە دەبێت ، هەندێ (عامل) پێویستی ڕەفع دەکات لەسەر (فاعل) یا لەجۆری ئەمە ، یەکێکی تر پێویستی (نَصب) دەکات لەسەر (مفعول) یا لەجۆری ئەو... وە هەروەها بەم شێوە.**

**بۆ نموونە ئەگەر گوتم (حضر محمد) (محمد) مەرفوعە ، چونکە کارلێکراوێکە بۆ کارلێکەرێك کە پێویستی ڕەفع دەکات لەسەر (فاعل) وە ئەو (عامل) ەش (حضر) ەیە .**

**ئەگەر گوتم (رایت محمداً) باری کۆتایی (محمد) گۆڕا بۆ (نصب) لەبەر گۆڕانی عامیلێك بە عامیلێکی تر کە پێویستی (نصب) دەکات کە ئەویش (رایت) وە ، وە ئەگەر گوتم (حظیتُ بمحمد) باری کۆتایی**

**(محمد) گۆڕا بۆ جەڕ لەبەر گۆڕانی عامیلێکی بە عامیلەکەی تر کە پێویستی جەڕ دەکات کە پیتی (باء) ە .**

وإذا تأَمَّلْتَ في هذه الأمثلة ظهر لك أن آخِرَ الكلمة . وهو الدال من محمد . لم يتغير ، وأن الذي تغير هو أحوالُ[1] آخرها : فإنك تراه مرفوعاً في المثال الأوَّل ، ومنصوباً في المثال الثاني ، ومجروراً في المثال الثالث .

هذا التغير من حالة الرفع إلي حالة النصب إلى حالة الجرِّ هو الإعراب عند المؤلف ومن ذهب مذهبه ، وهذه الحركات الثلاث . التي هي الرفع ، والنصب ، والجرُّ . هي علامة وأَمَارَةُ[2] علي الإعراب .

**وەئەگەر وورد بیەوە لەو نموونانە بۆت دەر دەکەوێ کە کۆتایی ووشە لە (محمد) پیتی (دال) ە ، ئەم پیتە گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، ئەوەی کە گۆڕاوە باری کۆتایی ووشەکەیە دەبینی لە نموونەی یەکەم (مرفوع)ە، وە (منصوب)ە لە نموونەی دووەم، وە (مجرور) ە لە نموونەی سێ یەم.**

**ئەم گۆڕانەش لە حالەتی رەفع بۆ (نصب) بۆ حالەتی جەڕ ئەوە مانای (إعراب) ە لای دانەرو ئەوانەش کە لەسەر ڕێبازی ئەو دەڕۆن ، وە ئەم سێ حەرەکاتانەش کە رەفع و (نصب) و جەڕن، ئەوە علامەت و نیشانەن لەسەر (إعراب).**

ومثلُ الاسم في ذلك الفعلُ المضارعُ .

فلو قلت : " يُسَافِرُ إبراهيمُ " فيسافر: فعل مضارع مرفوع ؛ لتجرده من عامل

---

**(1) احوال: کۆیە / تاکەکەی (حال) ە ، واتە: بار ، چۆنیەتی ،**

**(2) أمارة : نیشانە ، کۆیەکەی (أمارات)ە.**

يقتضي نصبه أو عامل يقتضي جزمه ، فإذا قلت: ( لَنْ يُسَافِرَ إبراهيـمُ ) تغير حال " يسافر " من الرفع إلي النصب ، لتغير العامل بعامل آخر يقتضي نصبه ، وهو " لَنْ " ، فإذا قلت: " لَمْ يُسَافِرْ إبراهيمُ " تَغَيَّرَ حالُ " يسافر " من الرفع أو النصب إلي الجزم ، لتغير العامل بعامل آخر يقتضي جزمه ، وهو "لم" .

**وه وەكو (إسم) ە لەمەدا فيعلى (مضارع).**

**ئەگەر بڵێ ی (يُسافر ابراهيم) (يسافر) فعل مضارع مرفوع لەبەر نەبوونى عاميلێك لێرەدا (نصب) ی بكات يا جەزم.**

**وه ئەگەر گوتت (لن يسافر ابراهيم) حالی (يسافر) گۆڕا لە رەفع بۆ (نصب) لەبەر گۆڕانی عاميل بە عاميلەكی تر كەوا پێويست دەكات (منصوب) بێت، ئەو عاميلەش (لن)ە.**

**ئەگەر گوتت (لم يسافرْ ابراهيمُ) باری (يسافر) گۆڕا لە رەفع يا (نصب) بۆ جەزم ، لەبەر گۆڕانی عاميلەك بە عاميلەكی تر كەوا پێويست دەكات جەزم بێت كە ئەويش (لم)ە.**

واعلم أن هذا التغير ينقسِمُ إلي قسمين : لَفْظِيّ ، وتقديري .

فأما اللفظي فهو : مالا يمنع من النطق به مانع كما رأيت في حركات الدال من " محمد " وحركات الراء من " يسافر " .

وأما التقديري : فهو ما يمنع من التلفظ به مانع من تَعَذُّر[1]، أو استِثقال[2]، أو مناسَبَة ؛ تقول: (يَدْعُو الفتَى والْقَاضِي وغلاَمِي) فيدعو : مرفوع لتجرده من الناصب والجازم ، والفتى: مرفوع لكونه فاعلاً ، والقاضي وغلامي : مرفوعان

---

(1) **تعذر: ئەوەيە كە نەتوانی حەرەكەكە بخوێنيەوە ، عوزرت هەيە لەمە.**

(2) **استثقال: قورسی.**

لأنهما معطوفان[١] علي الفاعل المرفوع ، ولكن الضمة[٢] لا تظهر في أواخر هذه الكلمات ، لتعذرها في " الفتى " وثقلها في " يَدْعُو" وفي "الْقَاضِي " ولأجل مناسبة ياء المتكلم في " غُلاَمِي " ؛ فتكون الضمة مقدّرة علي آخر الكلمة منع من ظهورها التعذر ، أو الثقل ، أو اشتغال المحل بحركة المناسبة .

**وە بزانە ئەم گۆڕانە دابەش دەبێت بۆ دوو بەش بە قسەو بە تەقدیر/**

**بە قسە ئەوەیە هیچ مانعێك نی یە لەوەی بە قسە بیڵێ ی هەروەکو بینیت لە حەرەکەکانی پیتی (دال) لە (محمد) وە حەرەکاتی (راء) لە ووشەی (یسافر).**

**وە تەقدیر ئەوەیە مانعێك و ڕێگرێك هەیە لەوەی کە بە قسە ئەم گۆڕانکاریانەی کە لە کۆتایی ووشە دەبێ بگوترێ، جا ئەوەش لەبەر نەگونجان (تَعذّر) یا لەبەر قورسی (إستثقال) یا (مناسبة).**

**دەڵێ ی (یدعو الفتی والقاضي وغلامي)[٣] (یدعو) مەرفوعە لەبەر**

---

(1) **معطوفان: (عطف) ووشەیەك شوێنی ووشەیەك بکەوی.**

(2)**الضمة: بۆر**

(3) **يدعو الفتى والقاضي وغلامي**

**يدعو : فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها الثقل.**

**الفتى: فاعل مرفوع وعلامة رفعه ضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها (التعذر).**

**والقاضي: الواو: حرف عطف (القاضي) معطوف مرفوع بضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها (الثقل).**

**وغلامي: الواو حرف عطف (غلامِي) معطوف مرفوع بضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها اشتغال المحل بحركة المناسبة وهو مضاف، والياء مضاف اليه.**

ئەوەی هیچ ئەداتێکی (نصب) و جەزمی نەچۆتە سەر ، (الفتی) مەرفوعە لەبەر ئەوەی فاعیلە ، وە (القاضي) وە (غلامي) مەرفوعن لەبەر ئەوەی شوێنی فاعیلێکی مەرفووع کەوتوونە ، بەڵام بۆر (ضمە) دیار نی یە لەسەر کۆتاییەکانی ئەم ووشانە ، لەبەر نەگونجان (تعذر) لە (الفتی) وەلەبەر قورسی لە (یدعو) وە لە (القاضي) وەلەبەر (مناسبە)ی (یاء)ی قسەکار لە (غلامي).

جا بۆر (ضمة) تقدیر دەکرێ لەسەر کۆتایی ووشە رێ ی لێ دەگیرێ لەوەی دەرکەوێ لەبەر (تعذر) یا (ثقل) یا مەشغول بوونی شوێنەکە بەحەرەکەی موناسیبە (چونکە بۆ نموونە [ (غلامی) بۆ میمەکە کەسرە موناسیبە بۆی چونکە یائی لەدوا دێت یائیش کەسرەی بۆ موناسیبە کە لە پێشی بێت] .

وە دەڵێی: " لَنْ يَرْضَي الْفَتى وَ الْقَاضِي وَ غُلاَمِي " وتقول: " إنَّ الْفَتَى وَ غُلاَمِي لَفَائِزَانِ " وتقول : " مَرَرْتُ بِالْفَتَى و غُلاَمِي و الْقَاضِي " .

ئەوەی کە کۆتاییەکەی ئەلیفێکی بنەڕەتی و لازمی هەیە نەك (عارض) تووشهاتوو هەموو حەرەکاتەکانی لەسەر تەقدیر دەکرێ (للتعذر) وە ئەو ناوەش کە بە ئەلیف کۆتایی دێت پێ ی دەوترێ (مقصور)* وەك (الفتی)(١) العصا– الحجی(٢) – الرّحی(٣) – الرضا):

---

* مقصور ئەو ناوەیە کۆتایی یەکەی ئەلیفەو هەمزەی لەدوا نەهاتووەو ئەلیفەکەی (قصر) دەکرێت بەقەد پیتێکی مەددی سروشتی درێژ دەکرێتەوە

(1) الفتی : گەنج، الفتاه: ئافرەتی گەنج.

(2) الحجا : العقل ، ژیری.

(3) الرحی: دەستار(حجر الرحی) بەردی دەستار، ئەمانە کاتی خۆی دانەوێڵەیان پێ دەهاڕی.

**وە ئەوەش کە کۆتاییەکەی ئەلیفێکی بنەڕەتی و لازمی هەیە بۆر (ضمة) و کەسرەی لەسەر تقدیر دەکرێ لەبەر قورسی (للثقل) وە ئەو ناوەش کە بە (یاء) کۆتایی دێت پێ ی دەوترێت (منقوص) وە ناوی (منقوص) تەنها فەتحەی لەسەر بەدیار دەکەوی لەبەر سووکی وەك:**

(القاضِيَ – الدَّاعيَ – الغازيَ - الساعيَ - الآتيَ[1] - الرَّامِيَ)

**وە ئەوەش کە (مضاف)ە بۆ (یاء المتکلم) هەموو حەرەکاتەکانی لەسەر تەقدیرو تەخمین دەکرێ لەبەر (مناسبة) ی (یاء المتکلم) وەك:**

(غلامِي – كتابي - صديقي - ابني - أُستاذي).

ويقابل الإعرابَ البناء ، و يتضح كل واحدٍ منهما تمامَ الاتّضَاحِ بسبب بيان الآخرَ.

وقد ترك المؤلفُ بيان البناء ، ونحن نبينه لك علي الطريقة التي بيَّنا بها الإعراب ، فنقول :

للبناء معنيان : أحدهما لغويّ ، والآخر اصطلاحيّ :

فأما معناه في اللغة فهو عبارة عن وَضْع شيءٍ علي شيءٍ علي جهَة يُرَادُ بها الثبوتُ و اللزومُ .

وأما معناه في الاصطلاح فهو لُزُومُ آخر الكلمة حالةً واحدةً لغير عامل و لا اعتلال ، وذلك كلزوم " كَمْ " و " مِنْ " السكون ، و كلزوم " هؤلاءِ "و " حَذَامِ " الكَسْرَ ، وكلزوم "مُنْذُ " و" حَيْثُ " الضمَّ ، وكلزوم "أيْنَ" و " كَيْفَ " الفتحَ .

ومن هذا الإيضاح تعلم أن ألقابِ البناءِ أربعة :١ - السكون، و٢ - الكسر،

---

(1) **الآتي : ئەوەی کە دێت.**

و٣ - الضم ، و٤ - الفتح .

وبعد بيان كل هذه الأشياء لا تَعْسُرُ عليك معرفة المعرب والمبني ، فإن المعرب : ما تَغَيَّرَ حالُ آخِرِهِ لفظاً أو تقديراً بسبب العوامل.

والمبني : ما لزم آخرُهُ حالَةً واحدةً لغير عامل و اعتلال .

**وە بەرامبەر (إعراب) (بناء) ە وەهەر يەكێك لەمانە بەتەواوی روون دەبێتەوە بەهۆی روون كردنەوەی ئەوی تریان.**

**وە دانەر باسی (بناء) ی نەكردووە، وە ئێمە روونی دەكەینەوە بۆت بەم شێوەی كە باسی (إعراب) مان كردووە دەڵێین:**

**(بناء) دوو مانای هەیە یەكێكیان لە زمانەوانیدا ئەوی تریان لە زاراوەدا ، مانای لە زمانەوانیدا بریتیە : لە دانانی شتێك لەسەر شتێك بە شێوەیەك مەبەست پیٚ ی جێگیرو چەسپاوكردن بێت (وەك درووست كردنی خانوو) .**

**وە مانای لە زاراوەدا (واتە لە لێكدانەوەی زانایانی نەحوی) بریتیە لە جێگیربوونی كۆتایی ووشە لەسەر یەك بارو حالەتدا، بەبیٚ ئەوەی عامیلەك وای لێكردبێت یا بۆ خۆی (معتل[1] الآخر) بێت وەك (الفتى).**

**وەك: (كمْ) وە (مِنْ) بەردەوام سكون دارن، وە (هؤلاءِ) و (حذامِ) وە (أمس) بەردەوام كەسرە دارن ، وە (منذُ) وە (حيثُ) بەردەوام بۆر (ضمة) یان هەیە، وە (أينَ) و (كيفَ) بەردەوام فەتحەیان هەیە.**

---

(1) معتل: مريض، سقيم ، نەخۆش، (معتل) ، فيه حرف علة / حەرفێكی عیللەی تێدایە.واتە: ئەلیف / یان واو، یان یاء..

لەم ڕوونکردنەوەیە بۆت دەردەکەوێ و دەزانی کە نیشانەکانی (بناء) چوارن :

١- سکون ٢- کەسرە ٣- بۆر (ضمة) ٤- فەتحە

لەدوای ڕوونکردنەوەی ئم شتانە زەحمەت نی یە لەسەرت ناسینی (معرب) و (مبنی)

(معرب) ئەوە کە حاڵی ئاخرەکەی بگۆڕێ بە قسە یا بە تەقدیرو مەزەندە بەهۆی گۆڕانی عامیلەکان

(مبنی) ئەوەیە کە ئاخیرەکەی یەك حالەتی جێگیری هەیە ، بەبێ ئەوەی عامیلەك وای لێ کردبێ یا (معتل الآخر) بێت بە ئەلیف و واو و یاء وەك (الفتی) کە حەرەکەی لەسەر دەرناکەوێ و حالی کۆتاییەکەی ناگۆڕێ .

# أنواع الإعراب/ جۆرەکانی (إعراب)

| |
|---|
| وأقسامه أربعة : ١ -رَفْعٌ ، وَ ٢ -نَصْبٌ ، وَ ٣ -خَفْضٌ، وَ ٤ -جَزْمٌ . |
| فللأسمَاءِ مِنْ ذَلِكَ ١ -الرَّفعُ ، ٢ -النَّصْبُ ، و ٣ -الخَفْضُ ،ولا جَزمَ فيها . |
| وللأفعال مِنْ ذَلِكَ ١ -الرَّفْعُ ، و٢ - النَّصبُ ، و ٣ -الجَزْمُ ، ولاَ خَفْضَ فيها |

**بەشەکانی إعراب چوارن ١- رەفع ٢- (نصب) ٣- جەڕ[1] ٤- جەزم**

**ناو لەم چوارە (سێیانیان وەردەگرێ) ١- رەفع ٢- (نصب) ٣- جەڕ ، ناو جەزم وەرناگرێ.**

**وە فیعل لەم چوارە (سێیانیان وەردەگرێ) ١- رەفع ٢- (نصب) ٣- جەزم، فیعل جەڕ (خفض) وەرناگرێ.**

وأقول : أنواع الإعراب التي تقع في الاسم و الفعل جميعاً أربعة : الأوَّل : الرفع ، و الثاني : النصب ، والثالث : الخفض ، والرابع : الجزم ، ولكل واحد من هذه الأنواع الأربعة معني في اللغة، ومعني في اصطلاح النحاة.

أما الرفع فهو في اللغة : العُلُوُّ والارتفاعُ .

وهو في الاصطلاح : تغير مخصوصٌ علامَتُهُ الضمة وما ناب عنها ، وستعرف قريباً ما ينوب عن الضمة في الفصل الآتي إن شاء الله .

ويقع الرفع في كل من الاسم والفعل ، نحو: " يَقُومُ عَليٌ " و " يَصْدَحُ البُلْبُلُ".

---

(1) **جەڕ: جیاوازی نی یە لە گەڵ (خفض)، کوفیەکان (خفض) یان بەکارهێناوە ، بەسراییەکانیش (جرّ).**

وأما النصبُ فهو اللغة : الاسْتِواءُ والاسْتِقَامَة .

وهو في الاصطلاح : تغير مخصوص علامته الفَتْحَة وما ناب عنها ، ويقع النَّصْبُ في كل من الاسم والفعل أيضاً ، نحو : " لَنْ أُحِبَّ الكَسَلَ " .

وأما الخفض فهو في اللغة : التَسَفُّلُ .

وهو في الاصطلاح : تغيُّر مخصوصٌ علامتُهُ الكَسْرَة وما نابَ عنها ، ولا يكون الخفض إلا في الاسم ، نحو:" تَأَلَّمْتُ مِنَ الكَسُولِ "

و أما الجزم فهو في اللغة : القَطْعُ .

وفي الاصطلاح تغيرٌ مخصُوصٌ علامتُهُ السُّكونُ وما نابَ عنه ، ولا يكون الجَزْمُ إلا في الفعل المضارع ، نحو " لَمْ يَفُزْ مُتَكَاسِلٌ " .

**وه دەڵێم جۆرەكانی (إعراب) كه دەكەوێته ناو (اسم) و فيعل هەموويان چوارن:**

**يەكەم : رەفع، دووەم (نصب) ٣- (خفض) ٤- جەزم.**

**وەهەر يەكێك لەمانە مانايەكی هەيە له زمانەوانيدا ، وه مانايەكی هەيە له زاراوەی نەحويەكان (واته له لێكدانەوەی زانايانی نەحوی) .**

**رەفع: لەزمانەوانيدا واته: بەرزی و بەرزبوونەوه وه له زاراوەدا : گۆڕانكاری يەكی تايبەته نيشانەكەی بۆر (ضمة) يه، يا ئەوەی جێ ی بۆر دەگرێتەوه ، وه له بابەتی دوای ئەوه (إنشاء الله) دەزانی كەچی جێی بۆر دەگرێتەوه.**

**نصب:لەزمان دا واته:راستبوون و رێكبوون وملەزاراوەدا : گۆڕانێكی تايبەته نيشانەكەی فەتحەيه ، يا ئەوەی جێی فەتحه دەگرێتەوه.**

**مُحَمَّدٍ) (رَضِيتُ عَنْ عَلِيٍ) (اسْتَفَدْتُ مِنْ مُعَاشَرَةِ خَالِدٍ) (أَعْجَبَنِي خُلُقُ بَكْرٍ) جا هەر یەكێك لە(محمد) و (علی) مجرورن لەبەر ئەوەی حەرفی جەڕیان چووەتە سەر ، وعلامة جره الكسرة الظاهرة ، وەهەر یەكێك لە (خالد) و (بكر) مجرورن لەبەر (إضافة) كردنی پێش خۆی بۆلای ئەو، وعلامة جره الكسرة الظاهرة ، وە (محمد) و (علی) و (خالد) و (بكر) ناوی تاكن (مُنصرف) ن، لەبەر ئەوەی كۆتاییەكانیان تەنوینی وەرگرتووە.**

والموضع الثاني : جمع التكسير المنصرف ، وقد عرفت مما سَبَقَ معنى جمع التكسير ، وعرفت في الموضع الأول هنا معني كونه (منصرفاً) ، وذلك نحو (مَرَرْتُ بِرِجَالٍ كِرَامٍ) ونحو (رَضِيتُ عَنْ أصْحَابٍ لَنَا شُجْعَانٍ) فكل من (رجال) و (أصحاب) مخفوض لدخول حرف الخفض عليه ، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة ، وكل من (كرام) و (شُجعَان) مخفوض لأنه نعت للمخفوض ، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة أيضاً ، و(رجال) و(أصحاب) و(كرام) و(شُجْعَان) : جموعُ تكسير ، وهي منصرفة ؛ للحوق التنوين لها .

**شوێنی دووەم (جمع تكسير المنصرف) لەمەوبەر زانیت جمع تكسير چییە، لەپێش ئەمەش زانیت كە (منصرف) بێت یانی چی، وە هەروەها تەنوین دەچێتە سەر كۆتایی ئەم جۆرە جەمعە، وەك (مَرَرْتُ بِرِجَالٍ كِرَامٍ) (رَضِيتُ عَنْ اصْحَابٍ لَنَا شُجْعَانٍ) جا هەر یەكێك لە (رجال) و (اصحاب) مجرورن چونكە حەرفی جەڕیان چووەتە سەر وعلامة جرهِ الكسرة الظاهرة، وەهەر یەكێك لە (كرام) و (شجعان) مجرورن لەبەر ئەوەی سیفەتی ناوێكی مجرورن ، وعلامة جره الكسرة الظاهرة، وە (رجال) و (اصحاب) و (كرام) و (شجعان) جەمعی تەكسیرن (منصرف)ن، چونكە تنوین چووەتە سەر كۆتاییەكەیان.**

والموضع الثالث : جمع المؤنث السالم ، وقد عرفت فيما سبق معني جمع المؤنث السالم ، وذلك نحو (نَظَرْتُ إلي فَتَيَاتٍ مُؤَدَّبَاتٍ) ،

ونحو (رَضِيتُ عن مُسْلِمَاتٍ قَانِتَاتٍ) فكل من " فَتَياتٍ" ، وَ"مسلمات" مخفوض ؛ لدخول حرف الخفض عليه ، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة . وكل من "مؤدَّبات" ، و"قانتات" مخفوض ؛ لأنه تابع للمخفوض ، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة أيضاً ، وكل من : (فتيات) و (مسلمات) و (مؤدبات) و (قانتات) : جمع مؤنث سالم .

**شوێنی سێ یەم: (کە مەجرور دەبێت بە کەسرە) (جمع مؤنث سالم)ە، لەوەی رابرد زانیت (جمع مؤنث سالم) چی یە، وەك (نَظَرْتُ إلي فَتَيَاتٍ مُؤَدَّبَاتٍ)، (رَضِيتُ عن مُسْلِمَاتٍ قَانِتَاتٍ) هەر یەکێك لە (فتیات) و (مسلمات) مجرورن، لەبەر ئەوەی حەرفی جەڕیان چووەتە سەر ، وعلامة جره الكسرة الظاهرة، وە هەر یەکێك لە (مؤدَبات) و (قانتات) مجرورن ، لەبەر ئەوەی نەعت[1] و سیفەتن تابع و شوێن کەوتەن بۆ مجرور وعلامة جره الكسرة الظاهرة، وە هەر یەکێك لە (فتیات) و (مسلمات) و (مؤدبات) و (قانتات)[2] (جمع مؤنث سالم)ن.**

---

**(1) نعت: واتە(صفە) واتە: ئاوەڵناو، جا (صفە) شوێنی (موصوف) وەسف کراو دەکەوێت لە (إعراب) دا ، واتە: لە رەفع و (نصب) و (جڕ)دا.**

**(2) قنوت: مل کەچی ، ئەوەیە فەرمانبەری بۆ خوا بکەیت لەگەڵ ترسان و سام و هەیبەت بەرانبەری (لزوم الطاعة مع الخضوع).**

## نيابة الياء عن الكسرة / جيگرتنى ياء لەبرى كەسرە

قال : وَأَمَّا الْيَاءُ فَتَكُونُ عَلاَمَةً لِلْخَفْضِ في ثَلاَثَةِ مَوَاضِعَ : في ١ -الأَسْمَاءِ الْخَمْسَةِ ، وَ٢ - في التَّثْنِيَةِ ، وَ٣ - الْجَمْعِ .

وأقول : للياء ثلاثةُ مواضعَ تكون في كل واحدٍ منها دالة علىأنَّ خفض الاسم.

**دانەر دەڵێ : ياء دەبێتە نيشانە بۆ جەڕ لە سێ شوێنان :**

**١- الأسماء الخمسة ٢- المثنى ٣- الجمع.**

**وە دەڵێم: ياء سێ شوێنی هەیە ، لەهەر یەکێکیان لەوان ئاماژەیە لەسەر (خفض) ی ناوەکە.**

الموضع الأول : الأسماء الخمسة، وقد عرفتها، وعرفت شروطَ إعرابها مما سبق ، وذلك نحو (سَلِّمْ عَلَي أبِيكَ صَبَاحَ كلِّ يَوْمٍ) ونحو (لا تَرْفَعْ صَوْتَكَ عَلَى صَوْتِ أخِيكَ الأكْبرِ) ونحو (لاَ تَكُن مُحِبًّا لذي المال إلاَّ أن يكون مُؤَدَّباً) فكل من (أبيك)، و(أخيك)، و(ذي المال) مخفوض؛ لدخول حرف الخفض عليه ، وعلامة خفضه الياءُ ، والكاف في الأوَّلَيْنِ ضميرُ المخاطَب ، وهي مضافٌ إليه مبني علي الفتح في محل خفض ، وكلمة (المال) في المثال الثالث مضافٌ إليه أيضاً ، مجرور بالكسرة الظاهرة .

**شوێنی یەکەم (الأسماء الخمسة)یە ، پێشتر ناسیوتە ، وە لەمەی کە رابرد مەرجەکانی (إعراب) یانت زانی، وەك (سَلِّمْ عَلَي ابِيكَ صَبَاحَ كلِّ يَوْمٍ) (لا تَرْفَعْ صَوْتَكَ عَلَي صَوْتِ اخِيكَ الأكْبرِ) (لاَ تَكُن مُحِبًّا لذي المال إلاَّ ان يكون مُؤَدَّباً) جا هەر یەکێك لە (ابيك) وە (اخيك) وە (ذي المال) مجرورن ، لەبەر ئەوەی حەرفی جەڕیان چووتە سەر ، وعلامة جره الياء،**

**كاف له دوو نموونەی یەكەم : ضمير المخاطب وهي مضاف إليه مبني على الفتح في محل جر، وە ووشەی (المال) له نموونەی سێ یەم : مضاف إليه مجرور بالكسرة الظاهرة.**

الموضع الثاني: المثنى، وذلك نحو (انْظُرْ إلي الْجُنْدِيَّيْنِ) ونحو (سَلَّمْ عَلَي الصَّدِيقَيْنِ) فكل من (الجنديين) و (الصديقين) مخفوض ؛ لدخول حرف الخفض عليه ، وعلامة خفضه الياءُ المفتوح ما قبلها المكسور ما بعدها ، وكل من (الجنديين) و (الصديقين) مُثَنَّي ؛ لأنه دال علي اثنين .

الموضع الثالث : جمع المذكر السالم ، نحو (رَضِيتُ عَنِ الْبَكْرِينَ) ، ونحو (نَظَرْتُ إلي المُسْلِمِينَ الْخَاشِعِينَ) فكل من (البكرين) و (المسلمين) مخفوض ؛ لدخول حرف الخفض عليه ، وعلامة خفضه الياءُ المكسور ما قبلها المفتوح ما بعدها ، وكل منهما جمع مذكر سالم .

**شوێنی دووەم (كە یاء لەجێی كەسرە دادەنیشێ) له (مثنى)یە، وەك: (انْظُرْ إلي الْجُنْدِيَّيْنِ) (سَلِّمْ عَلَي الصَّدِيقَيْنِ)[1] هەر یەك له (الجنديين) وە (الصديقين) مجرورن، لەبەر ئەوەی حەرفی جەڕیان چووەتە سەر وعلامه جره الياء كە پیتی پێشی فەتحەی هەیە وە پیتی دواشی ژێری هەیە ، وە هەر یەكێك له ((الجنديين) وە (الصديقين) (مثنى) ن، لەبەر ئەوەی ئاماژە بۆ دووان دەكەن.**

**شوێنی سێ یەم (كە یاء جێگرەوەیە بۆ كەسرە) له (جمع مذكر**

---

**(1) سلم على الصديقين: (سلم) فعل امر مبني على السكون والفاعل ضمير مستتر تقديره انت (على) حرف جر ، (الصديقين) اسم مجرور بالياء لأنه مثنى.**

سالم)ە، وەك (رَضِيتُ عَنِ الْبَكْرِينَ)[1] وە (نَظَرْتُ إلي المُسْلِمِينَ الْخَاشِعِينَ) هەر یەكێك لە (البكرين) وە (المسلمين) (مخفوض) ن، لەبەر ئەوەی حەرفی (خفض) یان چووەتە سەر، وعلامة خفضه الیاء، كە پیتی پێشی كەسرەی هەیە وە پیتی دواشی فەتحەی هەیە ، وەهەر یەكێكیشیان لەمانە (جمع مذكر سالم)ن.

---

(1) رضيت : فعل وفاعل (عن) حرف جر(البكرين) اسم مجرور بالياء لأنه جمع مذكر سالم

## نيابة الفتحة عن الكسرة / جێگرتنی فەتحە لە جیاتی کەسرە.

### ئاسانكارییەك بۆ ئەم بابەتە:

١- (الإسم الممنوع من الصرف) ئەو ناوانەن کە تەنوین وەرناگرن ، وە لەبری کەسرە مجرور دەبن بە فەتحە.

٢- لە دوازدە شوێن ناو دەبێتە (ممنوع من الصرف).

٣- دەبێ دوو هۆ هەبێت بۆ هەر ناوێك بۆ ئەوەی ببێتە (ممنوع من الصرف) جا لە دوازدە شوێنەکە نۆیانیان دوو هۆیان هەیە ، سێیانیشیان یەك هۆیان هەیە بەڵام جێی دووان دەگرنەوە.

٤- ناو (اسم) یا (علم) ە ، واتە ناوی دیار وەك : ابراهیم – فاطمة – عمر ، جا ئەم ناوە (علم)انە، لە شەش حالەتدا دەبنە (ممنوع من الصرف) هەر وەك لەم بابەتەدا باس دەکرێ.

وە یاخود ناو (اسم) یا (وصف) ە ، وەك : عَطشان– شَبعان نابینی ئەم دوو ناوە هەم ناون هەم وەسفیشی تێدایە بە تێنوو و تێر ، جا ئەم جۆرە ناوانەی کە (وصف) ن ، لەسێ حالەت دا دەبن بە (ممنوع من الصرف).

٥- وە سێ حالەتیشمان هەیە کە ناو پێی دەبێتە (ممنوع من الصرف) هەر یەکێکیان یەك عیللەتی هەیە بەڵام هەر یەکەیان جێی دووان دەگرنەوە هەروەکو ئەمانەش باس دەکرێ.

**قال : وَأَمَّا الْفَتْحَةُ فَتَكُونُ عَلاَمَةَ لِلْخفضِ في الاسمِ الذِي لا يَنْصَرِفُ .**

وأقول : للفتحة موضع واحد تكون علامة علي خفض الاسم ، وهو الاسم الذي لا ينصرف.

ومعني كونه (لا ينصرف) : أنه لا يَقْبَلُ الصَّرْفَ ، وهو التنوين ، والاسم الذي لا ينصرف هو: الذي أشْبَهَ الفعل في وجود علتين[1] فرعيتين: (إحداهما ترجع إلي اللفظ ، والأخرى ترجع إلي المعني) ، أو وُجدَ فيه علَّة واحدة تقوم مَقَام العِلَّتَينِ.

**دانەر دەڵێ : فەتحە نیشانەو عەلامەتە بۆ (خفض) لەو ناوانەی کە تەنوین وەرناگرن**

**وە دەڵێم: یەك شوێن بۆ فەتحە هەیە کە ببێتە نیشانەو عەلامەت بۆ (خفض) ی ناو ئەویش ئەو ناوەیە کە تەنوین وەرناگرێت.**

**مانای ئەوەی کە دەبێت (لا ینصرفُ) بێت، ئەوەیە کە (صَرف) قەبول ناکات، کە بریتیە لە تەنوین.**

**ئەو ناوەی کە تەنوین وەرناگرێ، ئەو ناوەیە کە بە فیعل دەچێت لە بوونی دوو هۆی لقی ، یەکێکیان بۆ لەفز[2] قسە دەگەڕێتەوە ، ئەوەی تریان بۆ مانا[3]، یا یەك هۆی تیادایە کە شوێنی هەردوو هۆیەکان دەگرێتەوە.**

---

(1) عِلّة: بەم مانایە دێت : ١- مرض ، داء ، واتە: نەخۆشی ٢- سبب، واتە: هۆ ، هۆکار ٣- عیب، خلل، واتە: ناتەواوی، کەم و کوڕی

(2) وەك: (العجمة) و (ترکیب) و (وزن الفعل) و (عدل) و .... ئەوانە دەگرێتەوە.

(3) عیللەو هۆی معنوی (العلمیة) و (الوصفیة) دەگرێتەوە.

و العلل التي توجد في الاسم وتَدُلُّ علي الفرعية وهي راجعة إلي المعني اثنتان لَيْسَ غَيْرُ : الأولي العَلَمِيَّةُ ، والثانية الوَصْفية.

ولابد من وجود واحدة من هاتين العلتين في الاسم الممنوع من الصرف بسبب وجود علتين فيه .

والعلل التي توجد في الاسم وتدل علي الفرعية وتكون راجعة إلي اللفظ ستُّ عِلَلٍ ، وهي: ١- التأنيث بغير ألف و٢- الْعُجْمَة و٣- التركيب و٤- زيادة الألف والنون و٥- وَزنُ الْفِعْلِ و٦- العَدْلُ .

ولابد من وجود واحدة من هذه العلل مع وجود العلمية فيه.

وأما مع الوصفية فلا يوجد منها إلا واحدةٌ من ثلاث ، وهي:

١ - زيادة الألف والنون أو ٢ -وزن الفعل أو ٣- العدل .

**ئەو هۆیانەی کە لە ناودا دەبینرێ مانای لق و فەرع دەداتەوە کە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ مانا دوانن و هیچی تر نین یەکەم: العلمیە، دووەم: الوصفیە.**

**وە دەبێ یەك لەم دوو هۆیە هەبن لە (الاسم الممنوع من الصرف) بەهۆی بوونی دوو عیلەت لەناویدا.**

**وە ئەو هۆیەی کە لەناودا هەیە لقی و فەرعی یە ، وە دەگەڕێتەوە بۆ لەفز شەش هۆن: ١- مێ بێت بەڵام کۆتاییەکەی ئەلیف نەبێت وەك (حبلى) ٢- بێگانە بێت و عەرەبی نەبێت ، ٣- لێکدراوبێت ، ٤- ألیف و نونی لە کۆتاییەکەی دا هەبێت، ٥- لەسەر وەزنی فیعل بێت، ٦- لادان لە شێوەیەك بۆ شێوەیەکی تر.**

**دەبێت یەکێك لەم شەشە لەگەڵ (العلمیە) دا هەبن (تا ببن بە (غیر**

**منصرف)، بەلأم (الوصفيه) هيچ يەكێكيان نابينی ئيللا يەك لە سێ شتانن كە ئەمانەن:**

**١- زيادەی ئەليف و نون ٢- وەزنی فيعل ٣- العدل.**

فمثال الْعَلَمِية مع التأنيث بغير ألف : فاطمة ، وزينب ، وحمزة .

ومثالُ العلمية مع العجمة[1] : إدريس ، ويعقوب ، وإبراهيم .

ومثالُ العلمية مع التركيب[2] : مَعْدِيكَرِبُ ، وبَعْلَبَكُّ ، وقَاضِيخَانُ .

ومثال العلمية[3] مع زيادة الألف والنون : مَرْوَانُ ، وعُثْمَانُ ، وغَطَفَانُ ، وعَفّانُ ، وسَحْبَانُ ، وسُفْيَانُ ، وعِمْرَانُ ، وَقَحْطَانُ ، وَعَدْنَانُ

ومثال العلمية مع وزن الفعل : أَحْمَد[4] ، وَيَشْكُرُ ، وَيَزِيدُ ، وتَغْلِبُ ، وَتَدْمُرُ .

ومثالُ العلمية مع العدل[5] : عُمَرُ ، وَزُفَرُ ، وَقُثَمُ ، وَهُبَلُ ، وَزُحَلُ ، وجُمَحُ ، وَقُزَحُ ، وَمُضَرَ .

**ئەم بەشەی سەرەوە ئاسانەو زۆريشی نموونەيە بۆيە وەرم نەگێڕاوە بۆ كوردی، بەلأم لە پەراوێز هەندێ روونكردنەوەم لەسەری داوە.**

ومثالُ الوصفية مع زيادة الألف والنون : رَيَّانُ ، وشَبْعَانُ ، ويَقْظَانُ .

---

(1) **العجمة: واتە ناوی عەرەبی نەبێت و عەرەب دايان نەنابێت، بێگانە بێت.**

(2) **تركيب: ناوی لێكدراو وەك (حضرموت) پێك هاتووە لە (حضر) وە (موت).**

(3) **علم: ناوی ديار.**

(4) **احمد: لە وەزندا بەم دوو فيعلە دەچێ (اكرم- احسن).**

(5) **العدل: لادراو لەشێوەيەك بۆ شێوەيەكی تر وەك (عمر) لە (عامر) ەوە هاتووە، وە (زُفَر) لە (زُافَر).**

**لە (النحو الواضح) دەربارەی (العدل) دەڵێ : ناوێكی سيانی نێر بێت يەكەم پيتی بۆرداربێت، دووەم پيتی فەتحەدار بێت (اذا كان مذكراً ثلاثياً مضموم الأول مفتوح الثاني).**

ومثالُ الوصفية مع وزن الفعل : أَكْرَمُ ، وَأَفْضَلُ ، وَأَجْمَلُ .

ومثالُ الوصفية مع العدل[1] : مَثْنَي[2] ، وَثُلاَثُ ، وَرُبَاعُ ، وَأُخَرُ[3] .

**گوتمان عیللەو هۆی (العلمیة) وە (الوصفیة)[4] (معنوی)ن، عیللە لەفزیەکان لێرەدا کە ئەلیف و نونی زیادەو وەزنی فیعل و عەدلە ، ئەمانە هەرسێکیان لە عیللە لەفزیەکانی (العلمیة)ش دان.**

وأما العلتان اللتان تقوم كل واحدة منهما مقام العلتين فهما:

١ - صيغة منتهي الجموع، ٢ - ألف التأنيث المقصورة أو الممدودة .

أما صيغة منتهي الجموع فضابِطُهَا : أن يكون الإسْمُ جمعَ تكسير، وقد وقع بعد ألف تكثيره حرفان نحو : مَسَاجِدَ ، وَمَنَابِرَ ، وَأَفاضِلَ ، وَأَمَاجِدَ ، وَأَماثِلَ ، وَحَوَائِض ، وَطَوامِثَ ، أو ثلاثةُ أحْرُف وَسَطُهَا ساكنٌ ، نحو : مَفَاتِيح ، وَعَصَافير ، وقَنَاديل .

---

**(1) عدل: لادراو لە شێوەیەك بۆ شێوەیەکی تر ، بۆ نموونە (مَثْنی) لە (إثنان ، إثنان) وەرگیراوە.**

**(2) (مَثْنی) دوو دوو (ثُلاثَ) سیٚ سیٚ (رباع) چوار چوار (أُحاد) یەك یەك ئەوەی لە عەرەبان بیستراوە ئەوان تا (رُباع)ەیان ژماردووە ، بەلاّم نەحویەکان تا دەیان لەسەر قیاس کردووە بەم شێوەیە:**

**(أُحاد و مَوحَدَ، ثُناء و مَثْنی، ثُلاثَ و مَثْلثَ، رُباعَ و مَربَع، خُماسَ و مَخمسَ، سُداسَ و مَسْدسَ، و سُباعَ و مَسْبع، ثُمانَ و مَثْمنَ، تُساعَ و مَتْسَعَ ، عُشارَ و مَعْشَر).**

**دەڵێ ی (جاء الطّلابُ ثُلاثَ) واتە: قوتابییەکان سیٚ سیٚ هاتن.**

**(3) أُخَر: کۆیە، تاکەکەی (اخری)یە، (مؤنث)ی (آخر)یە.**

**(4) وصف: باسکردنی سیفات (وصف: صفه – نعت– ئاوەڵناو).**

وأما ألف التأنيث المقصورة فنحو : حبْلَي ، وَقُصْوَي ، وَدُنْيَا ، وَدَعْوى .

وأما ألف التأنيث الممدودة فنحو : حَمْرَاء ، وَدَعْجَاء ، وَحَسنَاء ، وَبَيْضَاء ، كَحْلاَء ، نافِقَاء ، وعُلَمَاء .

**وه ئهم دوو عيللهتهى كه ههر يهكێكيان لهمان له شوێنى دوو عيللهتن ئهوانيش :**

**١- (صيغة منتهى الجموع) شێوهى كۆتا جهمع، واته لهمه زياتر جهمع ناكرێ .**

**٢- ئهليفى مێ ى (مقصور) يا (ممدود).**

**جا (صيغه منتهى الجموع) بنچينهو قاعيدهى ئهوهيه كه دهبێ ناوهكه (جمع تكسير)بێت ، وه لهدواى ئهليفه تهكسيرهكهى دوو پيتى لهدوادا هاتبن وهك: (مساجد- منابر- افاضل- اماجد- اماثل- حوائض- طوامث) يا سێ پيتى لهدوادا هاتبێت لهم سێ پيته پيتهكهى ناوهندى سكوندار بێت وهك(مفاتيح،عصافير،قناديل) وه (الف التأنيث المقصورة)[1] وهك (حُبلى – قصوى- دنيا- دعوى) وه (اليف التأنيث الممدودة) وهك (حمراء- دعجاء- حسناء- بيضاء – كحلاء- ناقفاء- اصدقاء- علماء).**

فكلُّ ما ذكرناه من هذه الأسماء ، وكذا ما أشبهها ، لا يجوز تنوينُهُ ، ويُخفَضُ ، بالفتحة نيابة عن الكسرة ، نحو : (صَلَّي الله عَلَي إبْرَاهِيمَ خلِيلِه) ونحو : (رَضِيَ الله عَنْ عُمَرَ أمير المؤمنين): فكل من (إبراهيم) و (عمر) : مخفوض ؛ لدخول حرف الخفض عليه ، وعلامة خفضهما الفتحة نيابة عن الكسرة ؛ لأن كل واحد

---

**(1) بۆيه بهم ئهليفه دهوترێ (مقصوره) چونكه ههمزهى لهدوادا نههاتووه، بهقهد يهك ئهليفى سروشتى زياتر درێژ ناكرێتهوه.**

منهما اسمٍ لا ينصرف ، والمانع من صرف (إبراهيم) العلمية والعُجْمَةُ، والمانع من صرف عُمَرَ : العلمية و العَدْلُ .

وقِسْ علي ذلك الباقي .

ويشترط لخفض الإسمِ الذي لا ينصرف بالفتحة : ١- أن يكون خالياً من "أل" ٢ -وألا يُضافَ إلي اسْمٍ بعده . فإن اقترن بأل أو أُضيف؟ خُفِضَ بالكسرة ، نحو قوله تعالي ﴿ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِ ﴾ونحو : (مَرَرْتُ بحسْنَاءِ قُرَيشٍ).

**هەموو ئەو ناوانەی کە باسمان کردن ، وە هەروەها ئەوانەش کە لەمان دەچن ، نابێت تەنوین داریان بکەیت، وە (مجرور) دەبن بە فەتحە لەجیاتی کەسرە ، وەك (صَلَّي الله عَلَي إبْرَاهِيمَ خلِيلِه) وە وەك: (رَضِيَ الله عَنْ عُمَرَ امير المؤمنين) جا هەر یەکێك لە (ابراهیم) و (عمر) (مخفوض)ن، لەبەر ئەوەی حەرفی (خفض) یان چووەتە سەر، وعلامه خَفضِهما الفتحه نيابةً عن الكسره، لەبەر ئەوەی هەر یەکێك لەوان ناوێکە تەنوین وەرناگرێ وە مانع لە (صرف)ی (إبراهیم) (العلمية+ العجمة)يە، و مانع لە (صرف) ی (عمر) (العلمية+العدل)ە .**

**وە ئەوانی تریش لەسەر ئەمە قیاس بکە.**

**وە بەمەرج گیراوە بۆ ئەو ناوەی کە (غير منصرف)ە (مخفوض) دەبێت بە فەتحە لەبری کەسرە ١-نابێت (ال) ی چوبێتە سەر ٢- نابێت (إضافة) کرابێت بۆ ناوی دوای خۆی ، ئەگەر (ال) ی چووبوە سەر یا (إضافة) کرابوو ئەوە(مخفوض)دەبن بە کەسرە وەك خوا دەفەرموێ﴿ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِ ﴾[1]وە وەك (مَرَرْتُ بحسْنَاءِ قُرَيشٍ).**

(1) (البقرة-١٨٧).

# علامتا الجزم[1] / دوو نیشانەكانی جەزم

قال : وَلِلْجَزْمِ عَلامَتَانِ : ١ -السُّكُونُ ، و٢ -الْحَذْفُ .

وأقول : يمكنك أن تحكم على الكلمة بأنها مجزومة إذا وَجَدْتَ فيها واحداً من أمرين ؛ الأول : السكون ، وهو العلامة الأصلية للجزم، والثاني: الحذف،وهو العلامة الفرعية، ولكل واحد من هاتين العلامتين مواضع سنذكرها لك فيما يلي:

**دانەر دەڵێ : جەزم دوو عەلامەت و نیشانەی هەیە ، ١- سكون ٢- لێدەركردن(حذف).**

**وە دەڵێم : دەكرێ كە بڕیار بدەی لەسەر ووشەیەك كە مەجزومە ئەگەر یەك لە دوو شتت تیادا بینی یەكەم: زەنە (سكون) كە ئەمە عەلامەت و نیشانەی ئەسڵیە بۆ جەزم.**

**دووەم: لێدەركردن (حذف) كە ئەمەش نیشانەی لقیە، وە بۆ هەر یەكێك لەم دوو عەلامەتانە شوێنی خۆیان هەیە لەمەودوا باسیان دەكەین**

---

**(1) الجزم: القطع ، بڕین ، پچڕاندن، (جزم الحرف) اسكن آخرهُ: واتە: پیتەكەی وەستان زەنەو سكونی بۆ كرد.**

# موضع السكون / شوێنی زەنە (سکون)

| |
|---|
| قال : فَأَمَّا السُّكُونُ فَيَكُونُ عَلاَمَةً لِلْجَزْمِ في الْفِعْلِ الْمُضَارِعِ الصحيح الآخر . |

وأقول : للسكون موضع واحد يكون فيه علامةً علي أن الكلمة مجزومةٌ ، وهذا الموضع هو الفعل المضارع الصحيح الآخر ، ومعني كونه صحيح الآخر أن آخره ليس حرفا من حروف العلة الثلاثة التي هي:

١ - الألف و٢- الواو و٣-الياءُ .

**دانەر دەڵێ : سکون دەبێتە نیشانەو عەلامەت لە (الفعل المضارع الصحیح الآخر).**

**وە دەڵێم: سکون یەك شوێنی هەیە کە عەلامەت بێت لەسەر ئەوەی کە ووشەکە مەجزومە ، ئەو شوێنەش (الفعل المضارع الصحیح الآخر)ە، مانای کە دەبێت (صحیح الآخر) بێت ئەوەیە کە کۆتاییەکەی یەکێك نەبێت لە سێ پیتە نەخۆشەکان (العلة) کە ئەمانەن: ١- ئەلیف ٢-واو ٣-یاء.**

ومثال الفعل المضارع الصحيح الآخر (يلْعبُ)، وَ(يَنْجَحُ) ، وَ(يُسَافِر) ، و(يَعَدُ) ، وَ(يَسْأَلُ) فإذا قلت (لَمْ يَلْعَبْ عَلِيٌّ) و (لَمْ يَنْجحْ بَلِيدٌ) و (لَمْ يُسَافِرْ أخُوكَ) و (لَمْ يَعِدْ إبراهيمُ خَالِداً بشيء) و (لَمْ يَسْأَلْ بكْرٌ الأُسْتاذ) فكلٌّ من هذِه الأفعال مجزومٌ ، لسبق حرف الجزم الذي هو " لم" عليه ، وعلامة جزمه السكون ، وكل واحدٍ من هذهِ الأفعال فعلٌ مضارع صحيح الآخر .

**وە نموونەی (الفعل المضارع الصحیح الآخر) (يلْعبُ)، وَ(يَنْجَحُ) ، وَ(يُسَافِر) ، و(يَعِدُ) ، وَ(يَسْألُ) ئەگەر بڵێ ی (لَمْ يَلْعَبْ عَلِيٌّ) (لَمْ يَنْجَحْ**

بَلِيدٌ[1] (لَمْ يُسَافِرْ اخُوكَ) (لَمْ يَعِدْ إبراهيمُ خَالِداً بشيء) (لَمْ يَسْأَلْ بكْرٌ الأُسْتاذ) هەر یەكێك لەم فیعلانە مجزومن لەبەر ئەوەی حەرفی جەزمیان لەپێشدا هاتووە كە (لم)[2]ە ، وعلامة جزمه السكون ، وە هەر یەكێك لەم فیعلانەش (فعل مضارع صحيح الآخر)ن.

---

(1) لم: حرف نفي وجزم وقلب، (لم) بۆیە پێی دەوترێ (قلب) چونكە مانای فیعلە (مضارع)ەكە دەگۆڕێ بۆ ڕابردوو (ماضي) كە دەڵێ ی (لم يلعبْ علي) واتە : عەلی یاری نەكردووە.

(2) لم ينجح بليد/ واتە: ئەوەی زەینی كۆڕ بوو سەرنەكەوت(لم) حرف نفي و جزم و قلب (ينجح) فعل مضارع مجزوم بالسكون (بليد) فاعل مرفوع بالضمة.

## مواضع الحذف[1] / شوێنەكانی لێدەركردن (حذف)

| |
|---|
| قال : وأمَّا الْحذفُ فيَكُونُ عَلاَمَةً للجَزمِ ١-في الْفِعْل الْمُضَارِع الْمُعْتل الآخِر ، و٢ - في الأفْعَالِ الْخَمْسةِ التي رفْعُهَا بثبَاتِ النُّونِ[2]. |

وأقول: للحذف موضعان يكون في كل واحدٍ منهما دليلاً وعلامة علي جَزْمِ الكلمة.

**دانەر دەڵێ : لێدەركردن(حذف) دەبێتە عەلامەت و نیشانە بۆ جەزم**

**١- لە (فعل مضارع المعتل الآخر) ٢- لە (افعال الخمسة) كە مەرفوع دەبن بە جێگیر بوونی نون (ثبوت النون).**

**وە دەڵێم : لێدەركردن (حذف) دوو شوێنی هەیە ، لەهەر یەكێك لەم دوو شوێنە دەبێتە بەڵگەو نیشانە لەسەر ئەوەی كە ووشەكە مەجزومە.**

الموضع الأول :الفعل المضارع المعتلُ الآخِرِ ، ومعنى كونه مُعْتَلَّ الآخر أنَّ آخره حرف من حروف العلة الثلاثة التي هي ١- الألف و٢- الواو و٣- الياء ؛ فمثال الفعل المضارع الذي آخره ألف (يَسْعَى) ، وَ(يَرْضَى) ، وَ(يهْوَى) ، وَ(يَنْأَى) ، وِ(يَتْقَى).

ومثال الفعل المضارع الذي آخره واو (يَدْعُو) ، (يرْجُو) ، (يبْلُو) ، (يَسْمُو) ، (يَقْسُو) ، (ينْبُو).

ومثالُ الفعل المضارع الذي آخره ياءَ (يُعْطِي) ، وَ(يَقْضِي) ، وَ(يَسْتَغْشِي) ،

---

(1) **حذف: لابردن – لێدەركردن– سڕینەوە – پەڕاندن– قرتاندن.**

(2) **ثبات: جێگیربوون – نەجولان– مانەوە.**

وِ(يُحْيِي) ، وَ(يَلْوِي) ، وَ(يَهْدِي)، فإذا قلت : (لم يسْع عليٌّ إلي المجد) فإن (يسع) مجزوم ؛ لسبق حرف الجزم عليه ، وعلامة جزمه حذفُ الألف ، والفتحةُ قبلها دليل عليها . وهو فعل مضارع معتل الآخر ، وإذا قلت : " لَمْ يدْعُ مُحمَّدٌ إلا إلي الحق " فإن "يَدْع " فعل مضارع مجزومٌ ؛ لسبق حرف الجزم عليه . وعلامة جزمه حذف الواو ، والضمة قبلها دليل عليها ، وإذا قلت : "لَمْ يُعْطِ مُحمَّدٌ إلا خالداً " فإن "يُعْطِ " فعلٌ مضارع مجزوم لسبق حرف الجزم عليه ، وعلامة جزمه حذف الياء والكسرة قبلها دليل عليها ، وقِسْ علي ذلك أخواتها[1].

**شوێنی یەکەم : (الفعل المضارع المعتل الآخر) کە دەڵێین دەبێ (معتل الآخر) بێت، واتە کۆتاییەکەی یەکێکە لە پیتەکانی (عِلّة) کە ئەمانەن:**

**(اليف–واو–ياء ) نموونە لەسەر ئەو فیعلە(مضارع)ەی کە پیتی کۆتایی ئەلیفە (يَسعى – يَرضى– يَهوى– يَنأى– يشقى– يبقى) وە نموونە لەسەر ئەو فیعلە (مضارع)ەی کە کۆتاییەکەی پیتی (واو)ە (يَدْعُو) ، (يرْجُو) ، (يبْلُو) ، (يَسْمُو) ، (يَقْسُو) ، (ينْبُو).**

**وە نموونە لەسەر ئەو فیعلە (مضارع)ەی کە کۆتاییەکەی پیتی (ياء)ە (يُعْطِي) ، (يَقْضِي) ، (يَسْتَغْشِي) ، (يُحْيِي)، (يَلْوِي) ، (يَهْدِي).**

**ئەگەر گوتت (لم يَسعَ عليٌّ إلى المجد) [2] (يَسعَ) ئەمە مەجزومە ، لەبەر**

---

(1) **اخوات: کۆیە، تاکەکەی (اُخت)ە، واتە: خوشك.**

(2) **لم يسعَ عليٌّ إلى المجد: واتە: عەلی هەوڵ و کۆششی نەکرد بۆ گەیشتن بە بەرزی**

**لم: حرف نفي وجزم وقلب.**

**يَسعَ: فعل مضارع مجزوم وعلامة جزمه حذف حرف العلة وهي الألف.**

**عليٌّ: فاعل مرفوع بالضمة.**

**إلى: حرف جر (المجدِ) اسم مجرور بالكسرة.**

**ئەوەی (لم)ی لەپێشە کە حەرفی جەزمە، وعلامة جزمه حذف حرف العلّة وهي الألف ، وە فەتحەی سەر عەینەکەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پیتی ئەلیف (حذف) کراوە، وە ئەم ووشەیەش فیعلێکی (مضارع)ی (معتل الآخر)ە.**

**وە ئەگەر گوتت (لم يَدع محمد إلا إلى الحق) (يدعُ) فعل مضارع مجزوم لسبق حرف الجزم عليه ، وعلامة جزمه حذف الواو، وە ئەو بۆرەی سەر عەینەکە بەڵگەیە لەسەر ئەمە کە واو قرتێندراوە.**

**وە ئەگەر گوتت (لم يُعطِ محمد إلا خالداً) (يُعطِ) فعل مضارع مجزوم ، لەبەر ئەوەی حەرفی جەزمی لە پێشە کە (لم)ە، وعلامة جزمه حذف الياء ، وە ئەم کەسرەش کە لەژێر کۆتاییەکەیەتی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پیتی (ياء) سڕاوەتەوە.**

**وە خوشکەکانی تریشی لەسەر ئەم بنچینەیە قیاس بکە.**

الموضع الثاني : الأفعال الخمسة التي ترفع بثبوت النون ، وقد سبق بيانُها[1] ، ومثالها (يضربان) ، و(تضربان) ، و(يضربون)، و(تضربون)، و(تضربين) تقول (لَمْ يَضْرِبَا) ،وَ(لِمْ تَضْرِبَا) ، وَ(لَمْ يَضْرِبُوا) ، وَ(لَمْ تَضْرِبُوا) ، و(لِمْ تَضْرِبِي) فكلُّ واحد من هذه الأفعال فعل مضارعٌ مجزوم ؛ لسبق حرف الجزم الذي هو " لم " عليه . وعلامة جزمه حذف النون ، والألف أو الواو أو الياء فاعل ، مبني علي السكون في محلّ رفع .

**شوێنی دووەم (الأفعال الخمسة)یە، ئەوەی  کە مەرفوع دەبێت بە جێگیر بوونی نون (ثبوت النون) وە پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە ، وە**

---

(1) **بيان: اظهار ، ايضاح: ئاشكراكردن ، روون كردنەوە.**

نموونە لەسەریان (یَضربان- تَضربان- یَضربون- تَضربون- تَضربین) دەڵێ ی (لم یضربا[1]- لم تضربا- لم یَضربوا- لم تضربوا- لم تضربي) هەر یەکێك لەم فیعلانە (فعل مضارع مجزوم)ن، لەبەر ئەوەی حەرفی جەزمیان چووەتە سەر کە (لم)ە، وعلامة جزمه حذف النون، الألف أو الواو أو الیاء، فاعل مبني علی السکون في محل رفع.

---

(1) لم یضربا: لێیان نەدا، لم: حرف نفي وجزم وقلب (یضربا) فعل مضارع مجزوم وعلامة جزمه حذف النون (والألف) ضمیر متصل مبني علی السکون في محل رفع فاعل.

# المعربات / ئەوانەی (إعراب) دەدرێن

قال: (فصل) المعرباتُ قِسمان: ١ -قسم يعرب بالحركات، و٢ -قسم يعرب بالحروف .

وأقول: أراد المؤلف . رحمه الله تعالى . بهذا الفصل أن يبين على وجه الإجمال[1] حكم ما سبق تفصيله في مواضع الإعراب.

والمواضع التي سبق ذكر أحكامها[2] في الإعراب تفصيلاً[3] ثمانية، وهي:

١ - الاسم المفرد، و٢- جمع التكسير، و٣- جمع المؤنث السالم، و٤- الفعل المضارع الذي لم يتصل بآخره شيء، و٥- المثنى، و٦- جمع المذكر السالم، و٧- الأسماء الخمسة، و٨- الأفعال الخمسة.

وهذه الأنواع التي هي مواضع الإعراب . تنقسم إلى قسمين: القسم الأول يعرب بالحركات، والقسم الثاني يعرب بالحروف، وسيأتي بيان كل نوع منها تفصيلاً.

**دانەر دەڵێ (فَصل) ئەوانەی (إعراب) دەدرێن دوو بەشن ١- هێندێکیان بەحەرەکات (واتە بۆرو فەتحەو کەسرە لەگەڵ پاشکۆیەکیش کە سکونە) (اعراب) دەدرێن، وە هەندێکیشیان بە پیت (إعراب) دەدرێن.**

**وە دەڵێم: دانەر – رەحمەتی خوای لێبێت– دەیەوێ بەم فەسڵە بە شێوەیەکی پوخت و کورت ئەوەی کە لە شوێنەکانی (إعراب) باس**

---

(1) الإجمال: ، بە کورتی

(2) احکام: کۆی (حکم)ە، واتە: یاسا.

(3) تفصیل: بەدرێژی.

کرابوو لێرەدا روونیان بکاتەوە.

ئەو بابەتانەی کە پێشتر باسی یاساکانی کرا لە (اعراب) بە درێژی هەشت بابەت بوون کە ئەمانەن:

١- الاسم المفرد، و٢-جمع التكسير، و٣-جمع المؤنث السالم، و٤-الفعل المضارع الذي لم يتصل بآخره شيء، و٥-المثنى، و٦-جمع المذكر السالم، و٧-الأسماء الخمسة، و٨-الأفعال الخمسة.

وە ئەم جۆرانە کە شوێنەکانی (إعراب)ن، دابەش دەبن بۆ دوو بەش:

بەشی یەکەم: بە حەرەکات (إعراب) دەدرێن، بەشی دووەم : بە پیت (إعراب) دەدرێن، وە لەمەودوا هەموویان بەدرێژی روون دەکرێتەوە.

## المعرب بالحركات / ئەوانەی (إعراب) دەكرێن بە حەرەكات

> قال: فالذي يعرب بالحركات أربعة أشياء: ١ -الاسم المفرد، و٢ -جمع التكسير، و٣ -جمع المؤنث السالم، و٤ -الفعل المضارع الذي لم يتصل بآخره شيء .

وأقول: الحركات ثلاثة، وهي: ١ الضمة و٢ الفتحة و٣ الكسرة، ويلحق[١] بها ٤ السكون، وقد علمت أن المعربات على قسمين: ١ قسم يعرب بالحركات، و٢ -قسم يعرب بالحروف.

**دانەر دەڵێ : ئەوەی (إعراب) دەدرێن بە حەرەكات چوار شتن :**

**١- الإسم المفرد ٢- جمع التكسير ٣- جمع مؤنث سالم ٤- الفعل المضارع الذي لم يتصل بآخره شيء.**

**وە دەڵێم: حەرەكەكان سیانن: ١- بۆر ٢- فەتحە ٣- كەسرە ٤- وە (سكون) یش دەخسترێتە پاڵیان.**

**وە لەمەوبەر زانیت (معربات) دوو بەشن : ١-بەشێكیان بە حەرەكات (إعراب) دەدرێن ٢- وە بەشێكیان بە پیت (إعراب) دەدرێن.**

وهذا شروع[٢] في بيان القسم الأول الذي يعرب بالحركات، وهو أربعة أشياء:

١ . الاسم المفرد، ومثاله " محمد " " والدرس " من قولك: (ذاكرَ محمدٌ الدرسَ) فـ (ذاكر): فعل ماض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب، و(محمد)

---

(1) إلحاق: خستنە پاڵ – پێ گەیاندن – خستنە سەر

(2) شروع: شرعَ: بدأ: دەستی پێكرد، مانای تریشی هەیە.

: فاعل مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، و(الدرس): مفعول به منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، وكلٌ من (محمد) و (الدرس) اسمٌ مفرد .

**وه ئەمەی خوارەوە دەست پیٚ كردنە بە روونكردنەوەی بەشی یەكەم ئەوەی كە (إعراب) دەدریٚ بە حەرەكات كە چوار شتن:**

**١- ناوی تاك، وەك (محمد) (الدّرس) كە دەلّیٚ ی (ذاكر محمد الدّرس) جا (ذاكر) فعل ماض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب (محمد) فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة (الدرسَ) مفعول به منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة ، وەهەر یەكیٚك لە (محمد) و (الدرس) ناوی تاكن.**

٢ . جمع التكسير، ومثاله (التلاميذ) و (الدروس) من قولك: (حفظ التلاميذ الدروس) ف(حفظ): فعل ماضٍ مبنيٌ على الفتح لا محلَّ له من الإعراب، و(التلاميذ): فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، و(الدروس): مفعول به منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، وكل من (التلاميذ)، و(الدروس) جمع تكسير.

**٢- ئەمەش باس لەوە دەكات كە (جمع تكسیر) یش بە حەرەكات (إعراب) دەدریٚ ، شتیٚكی ئەوتۆی تیادا نی یە بیكەم بە كوردی.**

٣ . جمعُ المؤنثِ السالمُ، ومثاله (المؤمنات)، و (الصلوات) من قولك: (خشع المؤمنات في الصلوات) ف(خشع): فعل ماض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب، (المؤمنات) : فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة ، و(في) حرف جر، و(الصلوات): مجرور ب(في)، وعلامة جره الكسرة الظاهرة ، وكل من (المؤمنات)، و(الصلوات) جمع مؤنث سالم .

**٣-ئەمەش باسی (جمع مؤنث سالم)ە، کە بە حەرەکات (إعراب) دەدریٚ.**

٤ . الفعل المضارع الذي لم يتصل بآخره شيء، ومثاله (يذهب) من قولك: (يذهب محمد)  ف(يذهب): فعل مضارع مرفوع لتجرده من الناصب والجازم، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، و(محمد) فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة .

**٤-ئەمەش باسی (فعل مضارع)ە، کە هیچ شتێکی بە کۆتاییەکەیەوە نەلکابێت، ئەمەش بەم شێوە بە حەرەکات (إعراب) دەدریٚ.**

## الأصل في إعراب ما يعرب بالحركات، وما خرج عنه / ئەسڵ لە (إعراب) ی ئەوانەی بەحەرەکات (إعراب) دەکرێن، وە ئەوانەش کە لەم بازنەیە دەردەچن.

قال: وَكُلُّها تُرفَعُ بالضَّمةِ، وَتُنصَبُ بِالفَتحَةِ، وَتخفَضُ بالكَسرَةِ وَتجزَمُ بالسُّكُونِ. وَخَرَجَ عَن ذَلِكَ ثَلاثَةُ أَشْياءٍ: جَمعُ المُؤنَّثِ السَّالِم ينُصَبُ بالكَسرَةِ. وَالاسمُ الذِي لا يَنصرِفُ يُخفَضُ بالفَتحَةِ. وَالفِعلُ المُضارِعُ المعتَلُّ الآخِرِ يُجزَمُ بِحَذفِ آخِرِهِ .

وأقول: الأصل في الأشياء الأربعة التي تعرب بالحركات: أن ترفع بالضمة وتنصب بالفتحة، وتخفض بالكسرة، وتجزم بالسكون .

**دانەر دەڵێ : هەموو ئەوانەی کە بەحەرەکات (إعراب) دەدرێن مرفوع دەبن بە (ضمة) وە (منصوب) دەبن بە فەتحەو مجرور دەبن بە کەسرە ، وە مجزوم دەبن بە سکون ، سێ شتن لەم بازنەیە دەردەچێ ، (جمع مؤنث سالم) (منصوب) دەبێت بە کەسرە ، (الإسم الذي لا ينصرف) مجرور دەبێت بە فەتحە ، وە (الفعل المضارع المعتل الآخر) مجزوم دەبێت بە لێدەرکردنی پیتی کۆتایی.**

**وە دەڵێم : ئەسڵ لەم چوار شتەی کە (إعراب) دەدرێن بە حەرەکات ئەوەیە کە مەرفوع بن بە (ضمة) وە (منصوب) بن بە فەتحە ، و مجرور بن بە کەسرە ، وە مەجزوم بن بە سکون.**

١ -أما الرفع بالضَّمة... فإنها كلَّها قد جاءت على ما هو الأصل فيها، فرفعُ جميعها بالضمة، ومثالها:

**١- رەفع بە (ضمة) ، هەموو ئەو ووشانەی کە مەرفوعن ، ئەسڵ چۆنە بەم شێوەیە هاتوون ، هەموویان مەرفوعن بە (ضمة) وەك:**

(يسُافِرُ مُحَمَّدٌ والأَصدقاءُ والمؤمناتُ)... ف(يسافر): فعل مضارع مرفوع لتجرده من الناصب والجازم، وعلامة رفعه الضمَّة الظاهرة، و(محمدٌ) فاعل مرفوع ، وعلامة رفعه الضمَّة الظاهرة، وهو اسم مفرد، و(الأضقاء): مرفوع لأنه معطوف على المرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، وهوجمعُ تكسير، و (المؤمناتُ) : مرفوع ، لأنهُ أيضاً معطوف على المرفوع ،. وعلامة رفعه الضَّمة الظاهرة، وهو جمع مؤنث سالم .

٢ - وأما النصب بالفتحة... فإنها كلها جاءَت على ما هو الصل فيها، ما عدا جمع المؤنث السالم، فإنه ينصب بالكسرة نيابة عن الفتحة، ومثالها :

**٢- وە (نصب) بە فەتحە ، هەموو ئەو ووشانەی (منصوب)ن، ئەسڵ چۆنە بەم شێوەیە هاتوون، واتە (منصوب)ن بە فەتحە، تەنها (جمع مؤنث سالم) نەبێت، ئەو (منصوب) دەبێت بە کەسرە لە جیاتی فەتحە وەك:**

(لَنْ أَخَالِفَ مُحَمَّداً وَالأَصْدِقَاءَ وَالمُؤمِناتِ) ف(أخالف): فعل مضارع منصوب ب(لَنْ)، وعلامة نصبه الفتحة لظاهرة، و(محمداً) مفعول به منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة أيضاً، وهو اسم مفرد كما علمت، و(الأصدقاء): منصوب لأَنَّه معطوف على المنصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة أيضاً، وهو جمع تكسير كما علمت، و(المؤمنات) منصوبٌ، لأَنَّه معطوف على المنصوب أيضاً، وعلامة نصبه الكسرة نيابة عن الفتحة، لأنه جمعُ مؤنَّثٍ سالمٌ .

٣ -وأما الخفض بالكسرة فإنها كلها قد جاءت على ما هو الأصل فيها، ما عدا الفعل المضارع، فإنه لا يخفض أصلاً، وما عدا الاسم الذي لا ينصرف، فإنه يخفض بالفتحة نيابة عن الكسرة، ومثالها:

**٣- وه (مجرور) بوون به كەسره ، هەموو ئەو ووشانەی (مجرور)ن، ئەسڵ چۆنە وا هاتوون، واتە هەموویان (نجرون) به كەسره، تەنها (فعل مضارع) نەبێت، كە ئەو هەر (مجرور) نابێت، وه جگە لە (الإسم الذي لا ينصرف) كە ئەمیش (مجرور) دەبێت به فەتحە لە بری كەسره وەك:**

(مَرَرتُ بِمُحَمَّدٍ، والرِّجالِ، والمُؤمِنَاتِ، وأَحْمَدَ) فـ(مررت): فعل وفاعل، والباء حرف خفض، و(محمد): مخفوض بالباء، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة، وهو اسم مفرد منصرف كما عرفت، و(الرجال): مخفوض، لأنه معطوف على المخفوض، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة، وهو جمع تكسير منصرف كما عرفت أيضاً، و(المؤمنات): مخفوض، لأنه معطوف على المخفوض أيضاً، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة وهو جمع مؤنث سالم كما عرفت أيضاً، و(أحمد): مخفوض، لأنه معطوف على المخفوض أيضاً، وعلامة خفضه الفتحة نيابة عن الكسرة، لأنه اسم لا ينصرف، والمانع له من الصرف العلمية ووزن الفعلِ.

٤ - وأما الجزم بالسكون فأنت تعلم أَنَّ الجزم مختص بالفعل المضارع، فإن كان صحيح الآخر فإن جزمه بالسكون كما هو الأصل في الجزم، ومثاله:

**٤- وه جەزم به سكون ، تۆ دەزانی جەزم تایبەتە به (فعل مضارع) ئەگەر پیتەكانی كۆتای (صحیح) بوون، (واتە: ئەلیف و واو و یاء نەبوون) ئەوە (مجزوم) دەبێت به سكون، هەروەكو ئەسڵ لە جەزم ئەوەیە ، وەك:**

(لَمْ يُسَافِرْ خَالِدٌ) فـ(لَمْ): حرف نفي وجزم وقلب، و(يُسَافِرْ): فعل مضارع مجزوم بـ(لم)، وعلامة جزمه السكون، و(خَالِدٌ): فاعل مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة.

**بەلأم**: ، وإن كان الفعل المضارع معتل الآخر كان جزمه بحذف حرف العلة، ومثاله:

**ئەگەر (فعل مضارع) ەكە (معتل الآخر) بوو (واتە ئاخیرەكەی پیتی الف – واو – یاء بوو) ئەوە (مجزوم) دەبێت بە لابردنی پیتە عیللەكە وەك :**

(لَمْ يَسْعَ بَكْرٌ)، و(لَمْ يَدْعُ) ، (ولَمْ يَقْضِ)، فكل من (يَسْعَ) و (يَدْعُ)، و (يَقْضِ) فعل مضارع مجزوم ب(لم) ، وعلامة جزمه حذف الألف من (يَسْعَ).. والفتحة قلها دليلٌ عليها، وحذف الواو من(يَدْعُ) والضَمَّةُ قبلها دليلٌ عليها، وحذف الياء من (يَقْضِ) والكسرة قبلها دليلٌ عليها .

**سوود:**

**كەواتە ئەو فیعل (مضارع)انەی كە (معتل الآخر)ن، لە كاتی جەزم بۆ ئەوەی بزانین چ پیتێكی لێ (حذف) بووە، ئەوە تەماشای حەرەكەی پیتی كۆتاییەكەی دەكەین ئەگەر فەتحەی لەسەر بوو ئەوە ئەلیف حەزف كراوە وە ئەگەر بۆری لەسەر بوو ئەوە واو قرتێندراوە ئەگەر كەسرەی هەبوو ئەوە یاء لابراوە وەك ئەو نموونانەی لای سەرەوە.**

**لم يسعَ بكر:**

**لم: حرف نفی و جزم وقلب(يسعَ) فعل مضارع مجزوم بحذف حرف العلة (حذف الألف) (بكر) فاعل مرفوع بالضمة.**

## المعربات بالحروف / ئەوانەی بە پیت (إعراب) دەدرێن

قال: وَالَّذي يُعرَبُ بالحُروفِ أَربَعَةُ أَنْوَاع: ١- التَثنِيَةُ، و٢- جمَعُ المُذكر السالم، والأسماء الخمسة، والأفعال الخمسة، وهي: يفعلان، وتفعلان، ويفعلون، وتفعلون، وتفعلين .

وأقول: القسم الثاني من المعربات: الشياء التي تعرب بالحروف، والحروف التي تكون علامة على الإعراب أربعة، وهي: الألف والواو والياء، والنون، والذي يعرب بهذه الحروف أربعة أشياء:

**دانەر دەڵێ : ئەوەی (إعراب) دەدرێ بە پیت چوار جۆرن ١- مثنى ٢- جمع مذكر سالم ٣- الأسماء الخمسة ٤-الأفعال الخمسة كە ئەمانەن (يفعلان - تفعلان- يفعلون- تفعلون - تفعلين)**

**وە دەڵێم : بەشی دووەم لەوانەی (إعراب) دەدرێن ، ئەو شتانەی کە (إعراب) دەدرێن بە پیت، وە ئەو پیتانەی نیشانەو عەلامەتی (إعراب)ن چوارن کە ئەمانەن (اليف- واو- ياء-نون) ئەوەی بەو پیتانەی (إعراب) دەدرێن چوار شتن.**

١ . التثنية، والمراد بها المثنى، ومثاله (المصران)، و(المحمدان)، و(البكران)، و(الرجلان).

٢ . جمع المذكر السالم، ومثاله (المسلمون)، و(البكرون)، و(المحمدون).

٣ . الأسماء الخمسة وهي: (أبوكَ)، و(أخوكَ)، و(حَمُوكَ)، و(فُوكَ)، و(ذُو مال)

٤ . الأفعال الخمسة ومثالها: (يَضرِبَانِ)، و(تَكْتُبَانِ)، و(يَفْهَمُونَ)، و(تَحْفَظُونَ)،

و (تَسْهَرِينَ).

وسيأتي بيان إعراب كل واحد من هذه الشياء الأربعة تفصيلاً .

**١- جووت، مەبەست پێ ی (المثنى) یە وەك : (المصران، المحمدان، البكران، الرجلان).**

**٢- جمع مذكر سالم، وەك: (المسلمون، البكرون، المحمدون).**

**٣- الأسماء الخمسة، وەك: (أبوكَ، اخوكَ،حَمُوكَ، فُوكَ، ذُو مال) .**

**٤- الأفعال الخمسة، وەك : (يَضرِبَانِ، تَكْتُبانِ، يَفْهَمُونَ، تَحْفَظُونَ، تَسْهَرِينَ).**

**وە لەمەودوا بە درێژی (إعراب) ی هەر یەكێك لەمانە روون دەكەینەوە.**

# إعراب المثنى / ئيعرابى جووت

قال: فأما التَثنيَةُ فَتُرفَع بالألِفِ، وتُنصَبُ وَتُخفَضُ باليَاءِ .

وأقول: الأول من الأشياء التي تعرب بالحروف " التثنية "، وهي: المثنى كما علمت، وقد عرفت فيما سبق تعريف المثنى.

وَحُكمُهُ: أنْ يرفع بالألف نيابةً عن الضمَّة، وينصب ويخفض بالياء المفتوح ما قبلها المكسور ما بعدها نيابة عن الفتحة أو الكسرة، ويوصل به بعد الألف أو الياء نُونٌ تكون عِوَضاً عن التنوين الذي يكون في الاسم المفرد، ولا تحذف هذه النون إلا عند الإضافة.

**دانەر دەڵێ جووت (مثنى) مەرفوع دەبێت بە ئەليف وە (منصوب) و (مجرور) دەبێت بە (ياء).**

**وە دەڵێم : يەكەم شت كە (إعراب) دەدرێ بە پيت جووتە كە (مثنى) يە هەروەكو زانيوتە ، وە لە پێشتريش پێناسەی (مثنى)ت زانيووە.**

**وە ياسای (مثنى) ئەوەيە كە مەرفوع دەبێت بە ئەليف لە بری بۆر، وە (منصوب) و مجرور دەبێت بە (ياء) ئەم (ياء)ەش پيتی پێشی فەتحەدارە وە پيتی دواوەشی كەسرەدارە ، لەبری فەتحە يا كەسرە ، وە نونێك بەدوای ئەليف و يائەكەدا دێت كە ئەمەش لەبری ئەم تەنوينەيە كە لەناوە تاكەكاندا هەيە (رجلٌ) – رجلانِ) وە ئەم نونەش لانابرێ تەنها لەكاتی (إضافة) [1] كردندا نەبێت.**

---

**(1) دەڵێ ی : مررتُ بجانبَي الطريقِ، واتە بەم لاو ئەو لای ڕێگاكەدا ڕۆيشتم. لێرەدا نەتگوت (بجانبين) چونكە (جانبي) (مضاف)ە.**

**مررتُ: فعل وفاعل، (الياء) حرف جر(جانبي) اسم مجرور بالياء لأنه مثنى وهو مضاف (الطريقِ) مضاف اليه.**

فمثال المثنى المرفوع (حَضَرَ الْقَاضِيَانِ، و(قالَ رَجُلانِ) فكل من (القاضيان)، و(رَجُلانِ) مرفوع لأنه فاعل، وعلامة رفعه الأَلف نيابةً عن الضمة، لأنهُ مثَّنى، والنون عوض عن التنوين في الاسم المفرد .

ومثال المثنى المنصوب (أُحِبُّ المؤدَّبيْن)، و(أَكْرَهُ المُتَكاسِلَيْن) فكل من (المؤدبين)، و(المتكاسلين) منصوب، لأنه مفعول به، وعلامة نصبه الياء المفتوح ما قبلها المكسور ما بعدها نيابة عن الفتحة، لأنه مثنى، والنون عوض عن التنوين في الاسم المفرد .

ومثال المثنى المخوض (نَظَرْتُ إلى الْفَارِسَيْن عَلىَ الْفرَسَيْن) فَكلُّ مِن (الفارسين) و(الفرسين) مخفوض، لدخول حرف الخفض إليه، وعلامة خفضه الياء المفتوح ما قبلها المكسور ما بعدها نيابة عن الكسرة، لأنه مثنى، والنون عوض عن التنوين في الاسم المفرد .

**نموونه لەسەر (مثنى) ی مەرفوع (حَضَرَ الْقَاضِيَانِ، و(قالَ رَجُلانِ) هەر یەکێك لە (القاضيان) وە (الرجلان) فاعل مرفوع وعلامة رفعه الألف نيابة عن الضمة لأنه مثنى، وە دوو نوونەکانیشیان لەجیاتی ئەو تەنوینەن کە لەناوە تاکەکیاندا هەیە (رجلٌ).**

**وە نموونە لەسەر (مثنى) ی (منصوب) (أُحِبُّ المؤدَّبيْن) (أكْرَهُ المُتَكاسِلَيْن) جا هەر یەکێك لە (المؤدبين) و (المتكاسلين) مفعول به منصوب وعلامة نصبه الياء المفتوح ما قبلها المكسور ما بعدها نيابة عن الفتحة لأنه مثني، وە نونیش لە بری ئەو تەنوینەیە کە لەناوە تاکەکانیاندا هەیە (مؤدّبٌ) (مُتكاسلٌ).**

**وە نموونە لەسەر (مثنى) ی مجرور(نَظَرْتُ إلى الْفَارِسَيْن عَلىَ الْفرَسَيْن) جا هەر یەك لە (الفارسين) (الفرسين) (مجرور) ن، چونکە حەرفی جەڕیان چووەتە سەر ، نظرتُ: فعل وفاعل (على) حرف جر (الفرسين) اسم**

مجرور وعلامة جره الياء لأنه مثنى (ياء)ەكەيان لە جياتى كەسرەن وە هەردووكيان پيتى پێشيان فەتحەى هەيە وە پيتى دوايان كەسرەى هەيە ، وە نونەكانيشيان لە برى ئەو تەنوينەن كە لەناوە تاكەكانياندا هەبووە (فارسٌ) (فرسٌ).

## إعراب جمع المذكر السالم / ئيعرابى كۆى نێرى سەلامەت

قال: وَأَمَّا جَمعُ المُذَكَّرِ السَّالِمُ فَيُرفَعُ بِالوَاوِ، ويُنصَبُ وَيُخفَضُ باليَاءِ .

وأقول: الثاني من الشياء التي تعرب بالحروف (جمع المذكر السالم) وقد عرفت فيما سبق تعريف جمع المذكر السالم.

وحكمه: أن يرفع بالواو نيابة عن الضمة وينصب ويخفض بالياءِ المكسور ما قبلها المفتوح ما بعدها نيابة عن الفتحة أو الكسرة، ويوصل به بعد الواو أو الياء نون تكون عوضاً عن التنوين في الاسم المفرد، وتحذف هذه النون عند الإضافة كنون المثنى.

**دانەر دەڵێ : (جمع مذكر سالم) مەرفوع دەبێت بە (واو) وە (منصوب) و (مجرور) دەبێت بە (ياء).**

**وە دەڵێم: دووەم شت لەوانەی کە بە پیت (إعراب) دەدرێن (جمع مذكر سالم)ە، وە لە پێشتریش زانیت پێناسەی (جمع مذكر سالم) چی یە وە یاساکەی بەم شێوەیە : مەرفوع دەبێت بە (واو) لە بری بۆر، وە (منصوب) و (مجرور) دەبێت بە (ياء) کە پیتەکەی پێشی کەسرەی هەیە وە پیتەکەی پاشی فەتحەی هەیە ، (ياء)ەکە لە بری فەتحەیە یا لە بری کەسرەیە ، وە نونێك لەدوای واوەکە یا یائەکە دێت ئەمەش لە بری ئەم تەنوینەیە کە لەناوە تاکەکەی دا هەیە (معلمٌ – معلمون) وە ئەم نونەش (حذف) دەکرێ لادەبرێ لە کاتی (إضافة)[1] کردن وەك (مثنى)**

---

**(1) دەڵێ ی : جاءَ مُعَلّمُو المدرسةِ/ جاءَ فعل ماض (معلمو) فاعل مرفوع بالواو لأنه (جمع مذكر سالم) وهو مضاف (المدرسةِ) مضاف اليه مجرور بالكسرة . لێرەدا (معلمو) چونکە (مضاف)ە نونەکەی لێ قرتێندراوە.**

فمثال جمع المذكر السالم المرفوع (حَضَرَ المُسْلِمُونَ) و (أَفْلَحَ الآمِرُونَ بالمْعرُوفِ) فكل من (المسلمون) و (الآمرون) مرفوع لأنه فاعل وعلامة رفعه الواو نيابة عن الضمةن لأنه جمع مذكر سالم، والنون عوض عن التنوين في الاسم المفرد.

ومثال جمع المذكر السالم المنصوب (رَأَيْتُ المُسْلِمِينَ)، و (احْتَرَمْتُ الآمِرِينَ بالمعروف)، فكل من (المسلمين) و (الآمرين) منصوب لأنه مفعول به ، وعلامة نصبه الياء .. المكسور ما قبلها المفتوح ما بعدها ، لأنه جمع مذكر سالم، والنون عِوَض عن التنوين في الاسم المفرد.

ومثال جمع المذكر السالم المخفوض : (اتصلتُ بالآمرين بالمَعْرُوفِ) و: (رَضِيَ الله عَنْ الْمُؤمِنينَ) فكل من (الآمرين)، و( المؤمنين) مخفوض، لدخول حرف الخفض عليه، وعلامة خفضه الياء المكسور ما قبلهاالمفتوح ما بعدها، لأنه جمع مذكر سالم، والنون عوض عن التنوين في الاسم المفرد.

**نموونه لەسەر (جمع مذكر سالم) ی مەرفوع (حَضَرَ المُسْلِمُونَ) (اَفْلَحَ الآمِرُونَ بالمَعرُوفِ) هەر یەکێك له (المسلمون) و (الآمرون) مەرفوعن لەبەر ئەوەی فاعلن وعلامة رفعه الواو نيابة عن الضمة لأنه جمع مذكر سالم ، وە نونەکەش لە بری تەنوینەکەی ناوە تاکەکەیانە.**

**وە نموونەی (جمع مذكر سالم) ی (منصوب) (رَاَيْتُ المُسْلمِينَ)، (احْتَرَمْتُ الآمِرِينَ بالمعروف)، جا هەریەکێك له (المسلمين) و (الآمرين) (منصوب) ن لەبەر ئەوەی (مفعول به)ن ، وعلامة نصبه الياء، كه پیتەکەی پێشی کەسرەی هەیە وە پیتەکەی دواشی فەتحەی هەیە ، لأنه جمع مذكر سالم، وە نونەکەشیان لەجیاتی تەنوینی ناوە تاکەکەیانە (مسلمٌ- مسلمون).**

وه نموونەی (جمع مذكر سالم) ی (مجرور) (اتصلتُ بالآمرين بالمَعْرُوفِ)و:(رَضِيَ الله عَنْ الْمُؤمِنِينَ)[1]جا هەریەكێك لە (الآمرين) و (المؤمنين) (مجرور)ن، لەبەر ئەوەی حەرفی جەریان چوەتە سەر ، وعلامة خفضه الياء المكسور ما قبلها المفتوح ما بعدها ، لأنه جمع مذكر سالم، والنون عوض عن التنوين في الإسم المفرد.

---

(1)(رضي الله عن المؤمنين) (رضي) فعل ماضي مبني على الفتح، (الله) لفظ الجلالة فاعل، (عن) حرف جر (المؤمنين) اسم مجرور بالياء لأنه جمع مذكر سالم.

# إعراب الأسماء الخمسة / ئيعرابى پێنج ناوەكان

قال: وأَمّا الأسمَاءُ الخَمسةُ فَتُرفَعُ بِالوَاو، وَتُنصَبُ بالأَلِفِ، وَتُخفَضُ بالياءِ .

وأقول: الثالث من الأشياء التي تعرب بالحروف (الأسماء الخمسة) وقد سبق بيانها وبيان شروط إعرابها هذا الإعراب .

وَحُكْمُهَا: أن تُرفَع بالواو نيابة عن الضمَّة، وتنصب بالألف نيابةً عن الفتحة وتخفَض بالياءِ نيابة عن الكسرة.

**دانەر دەڵێ : (اسماء الخمسة) مەرفوع دەبێت بە واو ، وە (منصوب) دەبێت بە ئەليف، وە (مجرور) دەبێت بە ياء.**

**وە دەڵێم: سێ يەم شت كە (إعراب) دەدرێت بە پيت (اسماء الخمسة) يە پێشتر رونمان كردۆتەوە ، وە مەرجەكانى (إعراب) كردنيان بەم شێوەيە ئەوەشمان روونكردۆتەوە.**

**ياساى (اسماء الخمسة) ئەوەيە : مەرفوع دەبێت بە واو لە جياتى بۆر، وە (منصوب) دەبێت بە ئەليف لە برى فەتحە، وە (مجرور) دەبێت بە ياء لە جياتى كەسرە.**

فمثال الأسماء الخمسة المرفوعة (إذا أَمَرَكَ أَبُوكَ فأطِعْهُ ) و (حَضَرَ أَخُوكَ مِن سَفَرِه) فكل من (أبوك) و (أخوك) مرفوع، لأنه فاعل، وعلامة رفعه الواو نيابة عن الضمة، لأنه من الأسماء الخمسة، والكاف مضاف إليه، مبني على الفتح في محل خفض .

ومثال الأسماء الخمسة المنصوبة (أَطِعْ أَباكَ) [1] ، وَ (أَحْبِبْ أَخَاكَ) فكل من (أباك) و (أخاك) منصوب، لأنه مفعول به، وعلامة نصبه الألف نيابة عن الفتحة، لأنه من الأسماء الخمسة، والكاف مضاف إليه، مبني على الفتح في محل جر، كما سبق .

ومثال الأسماء الخمسة المخفوضة (اِسْتَمِعْ إِلى أَبِيكَ) [2] و (أَشْفِقْ عَلى أَخِيكَ) فكل من (أبيك) و (أخيك) مخفوض، لدخول حرف الخفض عليه، وعلامة خفضه الياء نيابة عن الكسرة، لأنه من الأسماء الخمسة، والكاف مضاف إليه كما سبق .

**نموونەی (اسماء الخمسة) ی مەرفوع (إذا أَمَرَكَ أَبُوكَ فاطِعْهُ ) وە (حَضَرَ أَخُوكَ مِن سَفَرِه) هەر يەك لە (ابوك) و (اخوك) فاعل مرفوع وعلامة رفعه الواو نيابة عن الضمة ، لأنه من الأسماء الخمسة، وهو مضاف ، (والكاف) ضمير مبني على الفتح في محل خفض مضاف اليه ، ئەم دوو بەشەی تر شتێكی ئەوهای تیا نی یە تەرجەمەی بكەم تەنها یەك رستەم لێ لە پەراوێز (إعراب) كردووە.**

---

**(1) اطع اباك: أطع: فعل امر مبني على السكون ، والفاعل ضمير مستتر تقديره انت ، اباك: مفعول به منصوب بالألف لأنه من الأسماء الخمسة وهو مضاف، والكاف: مضاف إليه.**

**(2) إستمع إلى ابيك: استمع : فعل امر مبني على السكون ، والفاعل ضمير مستتر تقديره انت، إلى : حرف جر ، ابيك: اسم مجرور بالياء لأنه من الأسماء الخمسة وهو مضاف، والكاف: مضاف اليه..**

## إعراب الأفعال الخمسة / ئیعرابی پێنج فیعلەكان

قال: وَأَمَّا الأَفعَالُ الخمسَةُ فَتُرفَعُ بِالنُّونِ، وَتُنصَبُ وَتُجزَمُ بِحَذفِهَا .

وأقول: الرابع من الأشياء التي تعرب بالحروف (الأفعال الخمسة) وقد عرفت فيما سبق حقيقة الأفعال الخمسة.

وحكمها: أنها ترفع بثبوت النون نيابة عن الضمة، وتنصب وتجزم بحذف هذه النون نيابة عن الفتحة أو السكون.

**دانەر دەڵێ: (افعال الخمسة) .. مەرفوع دەبێت بە نون، وە (منصوب) و (مجزوم) دەبێت بە لێدەركردن و لابردنی نون.**

**وە دەڵێم: چوارەم شت لەوانەی كە (إعراب) دەدرێن بە پیت (الأفعال الخمسة) یە وە لەمەوبەر زانیت حەقیقەتی (افعال الخمسة) چی یە.**

**وە یاسای (افعال الخمسة) مەرفوع دەبێت بە جێگیر بوونی نون لە بری (ضمة) وە (منصوب) و (مجزوم) دەبێت بە قرتاندنی ئەم نونە لە بری فەتحە یا سكون.**

فمثال الأفعال الخمسة المرفوعة: (تَكْتُبَانِ) و (تَفْهَمَانِ) فكلّ منها فعل مضارع مرفوع، لتجرده من الناصب والجازم[1]، وعلامة رفعه ثبوت النون، والألف ضمير الأثنين فاعل، مبني على السكون في محل رفع .

ومثال الأفعال الخمسة المنصوبة: (لَنْ[2] تَحْزَنَا) و: (لَنْ تَفْشَلا)، فكل منهما

---

(1) **لتجرده من الناصب والجازم : هیچ شتێكی لەسەر نەبوو كە (نَصْب) ی بكات یا جەزم، (تَجَرُّد) واتە: رووت بوونەوە.**

(2) **لن: حرف نفي ونصب وإستقبال ، (استقبال) واتە : داهاتوو.**

فعل مضارع منصوب بلن، وعلامة نصبه حذف النون، والألف ضمير الأثنين فاعل مبني على السكون في محل رفع .

ومثال الأفعال الخمسة المجزومة: (لَم[1] تُذَاكِراَ) و (لَم تَفْهَمَا)، فكلّ منهما فعل مضارع مجزوم بلم، وعلامة جزمه حذف النون، والألف ضمير الأثنين فاعل مبني على السكون في محل رفع .

**ئەم بەشەش لەبەر ئەوەی زۆری (إعراب)ە ، هەر لە پەراوێز هەندێ شتم دەربارەی نوسیوە.**

---

(1) **لم: حرف نفي وجزم وقلب، (قلب) واته: ماناى (فعل مضارع) دەگۆڕێ بۆ رابردوو(ماضي).**

# بابُ الأفعال[1]

| |
|---|
| قال الأَفعالُ ثلاثَةٌ: ١ -مَاضٍ، و٢ -مُضارعٌ، و٣ -أَمرٌ، نحو: (ضَرَبَ) وَ(يَضربُ) وَ(أضرب). |

**دانەر دەڵێ: فیعل سێ جۆرن : رابردوو (ماضي) رانەبردوو (مضارع) فەرمان (امر) وەك (ضربَ – يَضربُ– اضْرب).**

## الأفعال وأنواعها / فیعل و جۆرەکانی

وأقول: ينقسم الفعل إلى ثلاثة أقسام:

القسم الأول: الماضي، وهو ما يَدُلُ[2] على حصول شيء قبل زمن التكلُّم، نحو: (ضَرَبَ) و(نَصَرَ)، و(فَتَحَ)، و(عَلِمَ)، و(حَسِبَ،و(كَرُمَ) .

والقسم الثاني: المضارع، وهو ما دلَّ على حصول شيء في زمن التكلُّم، أو بعده، نحو: (يَضْربُ)، و(يَنْصُرُ)، و(يَفْتَحُ)، وَ(يَعْلَمُ)، وَ(يَحْسِبُ)، وَ(يَكْرُمُ).

القسم الثالث: الأمر، وهو ما يطلب به حصول شيء بعد زمن التكلم، نحو: (اضْربْ، وَ(انْصُرْ)، و(افْتَحْ)، و(أعلَمْ)، و(احسِبْ)، و(اكْرُمْ) .

---

(1) **الأفعال: كۆيە ، تاكەكەی (فعل)ە ، واتە: فرمان –كار**

**فعل ماضي: فرمانی رابردوو**

**فعل مضارع : فرمانی رانەبردوو**

**فعل امر: فەرمان**

(2) **دَلَّ: نيشانی دا (يَدُلُّ) نيشان دەدات.**

وقد ذكرنا لك في أول الكتاب هذا التقسيم، وذكرنا لك معه علامات كل قسم من هذه الأقسام الثلاثة .

**وه دهڵێم: فیعل دابهش دهبێت بۆ سێ بهش :**

**بهشی یهکهم : (الماضي) ئهمه ئاماژه دهکات بۆ وهدهست هێنانی شتێك پێش کاتی قسه کردن وهك (ضرب– نصر– فتح– علم– حَسِبَ– كَرُم).**

**بهشی دووهم: (المضارع) ئهمه ئاماژه دهکات بۆ وهدهست هێنانی شتێك لهکاتی قسهکردن یا لهدوای قسهکردن وهك (يضرب– ينصر– يفتح– يعلم– يَحسِبُ– يكرُمُ).**

**بهشی سێ یهم: (الأمر) ئهوهیه بریتیه له داوای وهدهست هێنانی شتێك بکرێ بههۆی ئهم فیعله لهدوای کاتی قسهکردن وهك (إضرب– أُنصر– إفتح– إعلم– إحسب– أُكرُم).**

**لهسهرهتای ئهم کیتابه باسی ئهم دابهش بوونهمان کردووه ، وه بۆتمان باس کردووه نیشانهی ههر بهشێك لهم سێ بهشه.**

# أحكام الفعل / ياساكانى فيعل

قال: فالماضي مفتوح الآخر أبداً، والأمر مجزوم أبداً، والمضارع ما كان في أوله إحدى الزوائد الأربع التي يجمعها قولك " أنيت "، وهو مرفوع أبداً، حتى يدخل عليه ناصب أو جازم .

وأقول: بعد أن بيّنَ المصنفُ أنواع الأفعال ... شَرَعَ في بيان أَحكام كلّ نوع منها .

**دانەر دەڵێ : فیعلی (ماضي) بەبەردەوامی فەتحەدارە ، وە فیعلی ئەمر بە بەردەوام مەجزومە، وە فیعلی (مضارع) ئەوەیە کە یەکێك لەو پیتە زیادانەی لە سەرەتاکەی دێت کە لەم ووشەیەدا کۆدەبێتەوە (انیتُ) وە ئەوەش بەردەوام مەرفوعە ، تا شتێکی دەچێتە سەر کە (منصوب) یا مەجزومی دەکات وەك : (لم) و (لن) .**

**وە دەڵێم: لە دوای ئەوەی کە دانەر جۆرەکانی فیعلی روون کردەوە ، دەستی کرد بە روونکردنەوەی یاساکانی هەرجۆرێك لەوان.**

فحكم الفعل الماضي البناء على الفتح، وهذا الفتح إما ١ -ظاهر، وإما ٢ - مقدر.

أما الفتح الظاهر ففي الصحيح الآخر الذي لم يتصل به واو الجماعة، ولا ضمير رفع متحرك وكذلك في كل ما كان أخره واواً أو ياءً، نحو: (أَكْرَمَ)، وَ(قَدّمَ)، وَ(سَافَرَ)، ونحو: (سَافَرَتْ زَيْنَبُ)، وَ(حَضَرَتْ سُعَادُ)، ونحو: (رَضِيَ)، وَ(شَقِيَ)، وَنحو: (سَرُوَ، وَبَذُوَ).

**یاسای فیعلی (ماضي) (مبنی على الفتح)ە، وە ئەو فەتحەیەش یا**

ئاشكرايه يا مەزەندەو تەقديركراوە.

فەتحەی ئاشكرا لەو فيعل (ماضی)يانە بەدەر دەكەوێ كە (واو الجماعة) و (ضمير رفع متحرك)[1]يان پێوە نەنووساوە، وە هەروەها فەتحەكە ئاشكرا دەكرێت لەهەموو ئەو فيعل (ماضي) يانەی كە ئاخيريان پيتی (واو) و (ياء)ە، وەك (اكرمَ- قَدَّمَ- سافرَ) وە وەك (سافرت زينبُ) (حَضَرَتْ سُعَادُ)، وە وەك: (رَضِيَ، شَقِيَ)، وە وەك: (سَرُوَ- وبَذوَ).

## وأما الفتح المُقَدَّر... فهو على ثلاثة أنواع، لأنه:

إما ١- أن يكون مقدراً للتعذر، وهذا في كل ما كان آخره ألفاً، نحو: (دَعَا)، وَ(سَعَى) فكل منهما فعل مضارع مبني على فتح مقدرعلى الألف منع من ظهوره التعذر.

وإمَّا ٢- أن يكون الفتح مقدراً للمناسبة، وذلك في كل فعل ماض اتصل به واو الجماعة، نحو: (كَتَبُوا)، وَ(سَعِدُوا) فكل منهما فعل ماض مبني على فتح مقدر على آخره... منع من ظهوره اشتغال المحل بحركة المناسبة، و واو الجماعة مع كل منهما فاعل مبني على السكون في محل رفع.

وإما ٣- أن يكون الفتح مقدراً لدفع كراهة توالي أربع متحركات، وذلك في كل فعل ماض اتصل به ضمير رفع متحرك، كتاء الفاعل ونون النسوة، نحو: (كَتَبْتُ)، وَ(كَتَبْتَ)، وَ(كَتَبْتِ)، وَ(كَتَبْنَا)، وَ(كَتَبْنَ).. فكلُّ واحد من هذه الأفعال فعل ماض مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهوره اشتغال المحل بالسكون العارض

---

(1) ئەمە لە خوارەوە روون كراوەتەوە.

لدفع كراهة توالي أربع متحركات فيما هو كالكلمة الواحدة، والتاء، أو " نا " أو النون فاعل، مبني على الضم أو الفتح، أو الكسر، أو السكون في محل رفع .

**وه فەتحەی تەقدیرکراو ئەمەش سێ جۆرە لەبەر ئەوەی :**

**١- یا تەقدیر کراوە لەبەر (تعذر) ئەوەش لەهەموو ئەو فیعلانەیە کە ئاخیرەکەیان ئەلیفە وەك (دعا- سعی) هەر یەکێك لەمانە فعل ماضي مبني على فتح مقدر على الألف مُنع من ظهوره التعذر.**

**٢- یا فەتحەکە (مقدر) دەبێت لەبەر(مناسبە) ئەوەش لەهەموو فیعلێکی (ماضي) روو دەدات ، کە (واو الجماعة) ی پێوە لکابێت وەك: (كَتَبُوا) (سَعِدوا) هەر یەکێك لەمانە: فعل ماضي مبني على فتح مُقدر على آخره منع من ظهوره اشتغال المحل بحركة المناسبة ، و (واو الجماعة) مع كلٌّ منهما فاعلٌ مبني على السكون في محل رفع.**

**٣- یا فەتحەکە (مقدر)ە، بۆ نەهێشتنی ئەوەی کە چوار پیتی حەرەکەدار یەك لەدوای یەك بێن، وە ئەوەش لە هەموو فیعلێکی (ماض)دا کە (ضمير رفع المتحرك) ی پێوە لکابێت وەکو (تاء) ی فاعل یا (نون النسوة) وەك (كتبْتُ) (كتبْتَ) (كتبْتِ) (كتبنا) (كتبْنَ) هەر یەکێك لەم فیعلانە : فعلٌ ماضٍ مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهوره اشتغالُ المحلّ بالسكون العارض لدفع كراهة توالي اربع حركات فيما هو كالكلمة الواحدة وە (تاء) یا (نا) یا (نون النسوة) ضمير متصل مبني على الضمّ او الفتح او الكسر او السكون في محل رفع فاعل.**

## وحكم فعل الأمر: البناء على ما يجزم به مضارعهُ .

فإن كان مضارعه صحيح الآخر، ويجزم بالسكون، كان الأمر مبنياً على السكون، وهذا السكون إما ١ ظاهر، وإما ٢ مُقَدَّر، فالسكون الظاهر له موضعان، أحدهما: أن يكون صحيح الآخر ... ولم يتصل به شيء نحو: (اضرب)، و (اكتب)، وكذلك (اضربن) و (اكتبن) والثاني: أن تتصل به نون النسوة نحو: (اضربَنَّ) و (اكتُبَنَّ) مع الإسناد إلى نون النسوة.

وأما السكون المَقَدَّر.. فله موضع واحد ، وهو: أن تتصل به نون التوكيد الخفيفة .. أو الثقيلة : نحو: (اضْرِبَنْ) و: (اكْتُبَنْ) .

وإن كان مضارعه معتل الآخر.. فهو يجزم بحذف حرف العلة، فالأمر منه يُبنى على حذف حرف العلة، نحو (ادْعُ) و (اقْضِ) و (اسْعَ) .

وإن كان مضارعه من الأفعال الخمسة فهو يجزم بحذف النون، فالأمر منه يُبنى على حذف النون، نحو (اُكْتُبَا) و (اكتُبُوا) و (اُكْتُبي) .

**وە یاسای فیعلی ئەمر (مبنی) دەبێت بەوەی کە (مضارع)ەکەی پیْ ی مەجزوم دەبێت .**

**ئەگەر (مضارع) ەکەی (صحیح الآخر) [1] بوو مجزوم دەبوو بە سکون ئەوە فیعل ئەمرەکەی (مبني) دەبێت بە سکون[2].**

**وە ئەم سکونەش یا ئاشکرا دەبێت وەیا (مقدر).**

---

(1) واتە: ئەلیف و واو و یاء نەبوو

(2) (لم یخرجْ) لێرەدا فیعل (مضارع) مەجزومە بە سکون ، ئەگەر ئەمە بکەیە ئەمر (اُخرُجْ) دەبینی مەبنی دەبێت بە سکون.

**سکونی ئاشکرا دوو شوێنی هەیە ، یەکێکیان ئەوەیە کە (صحیح الآخر) بێت هیچی پێوە نەلکابێت وەك (إضربْ- اُكتبْ).**

**دووەم: (نون النسوه) ی پێوە لکابێت وەك (إضْربْنَ -اُكْتُبْنَ) لەگەڵ پاڵ دان بۆ (نون النسوة) (نونی (النسوة) فاعیله)، وە سکونی (مقدر) ئەوەش یەك شوێنی هەیە ئەویش ئەوەیە نونی تەوکیدی خەفیف یا (ثقیل) ی پێوە بنووسێ وەك (إضربنْ- اُكْتُبَنْ) وە وەك (إضْرِبَنَّ- اُكْتُبَنَّ).**

**وە ئەگەر (مضارع) ەکەی (معتل الآخر) [1] بوو ئەوە مەجزوم دەبێت بەلێدەرکردنی حەرفی عیللەکە ، وە فیعل ئەمرەکەشی مەبنی دەبێت بە (حذف حرف العلة) وەك (اُدعُ- إقضِ- إسعَ).**

**وە ئەگەر (مضارع) ەکەی لە (افعال الخمسة) بوو ، ئەوە مەجزوم دەبێت بە لابردنی نون، فیعلە ئەمرەکەشی مەبنی دەبێت بە لابردنی نون وەك : (اُكتُبا) (اكْتُبوا) (اكْتُبي) [2].**

والفعل المضارع علامته أن يكون في أوله حرف زائد من أربعة أحرف يجمعها قولك:

(أنيتُ) أو قولك (نأيتُ) أو قولك (أتين) أو قولك (نأتي)

فالهمزة للمتكلم مذكراً أو مؤنثاً، نحو (أفهم)

والنون للمتكلم الذي يعظم نفسه، أو للمتكلم الذي يكون معه غيره،

---

(1) **واتە: ئاخیرەکەی ئەلیف و واو و یاء بوو.**

(2) **اُكتبي: فعل أمر مبني على حذف النون و (الياء) ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل.**

نحو: (نَفْهَمُ).

والياءُ للغائب: نحو : (يَقُومُ) والتاء للمخاطب، أو تالغائبة ، نحو: ( أنْتَ تَفهَمُ يا مُحَمَّدُ وَاجِبَكَ)، ونحو: (تَفهَمُ زَيْنَبُ وَاجِبَهَا) .

فإن لم تكن هذه الحروف زائدة، بل كانت من أصل الفعل، نحو: (أكَلَ)، و(نَقَلَ)، و(تَفَلَ)، و(يَنَعَ) أو كان الحرف زائداً، لكنه ليس للدلالة على المعنى الذي ذكرناه، نحو: (أَكْرَمَ)، وَ(تَقَدَّمَ) " كان الفعل ماضياً لا مضارعاً .

**فيعل (مضارع) نيشانەی ئەوەیە لەسەرەتاکەی پیتێکی زیادەی هەیە لە چوار پیتان کە کۆدەبنەوە لە هەر یەکێك لەم وشانە (اتیتُ– نأیتُ– اتین– ناتي).**

**(هەمزە) بۆ قسەکاری نێرە یا مێیە وەك (أفهم).**

**(نون) بۆ قسەکەرێکە کە خۆی گەورە دەکا ، یا بۆ قسەکارێکە کە جگە لەخۆی ئیتریشی لەگەڵدایە وەك : نفهم**

**(یاء)[1] لەبۆ غایبی نێرە وەك (یقوم) وە (تاء) بۆ قسە لەگەڵ کراوی نێرە، یا غایبی مێ، وەك (انت تفهمُ یا محمد واجبك) وە وەك (تفهم زینبُ واجبها).**

**بەڵام ئەگەر ئەم چوار پیتە زیاد نەبوون بەڵکو لە ئەسڵی وشەکەدا بوون وەك (اکل– نَقل– تَفلَ– یَنعَ) یا پیتەکە زیاد بوو بەڵام ئاماژە نەبوو بۆ ئەو مانایەی کە باسمان کرد وەك (اکرمَ– تَقدَّمَ) ئەو کاتە فیعلەکە (ماضي) یە (مضارع) نییە.**

---

(1) **غائب: نادیار– شاراوە– ئامادەنەبوو.**

٥- وه نموونەی راناوی دووكەسی قسه لەگەڵدا كراو جا نێر بن يا مێ (ضَربتُما - حَفظتُما- اجتهدتُما) [١]

٦- وه نموونەی راناوی كۆمەڵی قسەلەگەڵداكراوی نێر (ضربتُم- حَفظتُم[٢]- اجتهدتُم).

٧- وه نموونەی راناوی كۆمەڵێ قسەلەگەڵداكراوی مێ (ضَربتُنَّ[٣]- حَفظتُنَّ- إجتَهدْتُنَّ)

٨ - ومثال ضمير الواحد المذكر الغائب (ضَرَبَ) في قولك: (مُحَمَّدٌ ضَرَبَ أَخاهُ) ، و: (حَفِظَ) .. في قولك (إبراهيمُ حَفِظَ دَرْسَهُ)، و : (اجْتَهَدَ) في قولك: (خَالِدٌ اجْتَهَدَ في عَمَلِهِ).

٩ -و مثال ضمير الواحدة المؤنثة الغائبة: (ضَرَبَتْ) ... في قولك (هند ضربت أختها) و (حفظت) في قولك (سعاد حفظت درسها) و (اجتهدت) في قولك: (زينب اجتهدت في عملها).

---

(1)اجتهدتُما: فعل ماضي مبني على السكون (تُما) ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل.

(2)حَفظتُم: فعل ماضي مبني على السكون (تُم) ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل.

(3)ضربْتُنَ: فعل ماضي مبني على السكون (تُنَّ) ضمير متصل مبني على الفتح في محل رفع فاعل.

٨- وه نموونه‌ی راناوی تاکی نێری ئاماده نه‌بوو (ضربَ) که ده‌ڵێی (محمد ضربَ اخاه) [١] وه (حفظ) که ده‌ڵێی (ابراهيمُ حفظ درسَهُ) وه (اجتهد) که ده‌ڵێی (خالد إجتهد في عَملِهِ)

٩- وه نموونه‌ی راناوی تاکی مێ ی نادیار (ضربَتْ) که ده‌ڵێی (هند ضربتْ اختها) وه (حَفظتْ) که ده‌ڵێی (سعادٌ حفظت درسَها) وه (اجتهدت) که ده‌ڵێی (زينبُ اجتهدت في عَملِها).

ومثال ضمير الاثنين الغائبين مذكرين مذكرين كانا أو مؤنثين (ضربا) في قولك: (المحمدان ضربا بكراً) [٢] أو قولك: (الهندان ضربتا عامراً) و (حفظا) في قولك: (المحمدان حفظا درسهما) أو قولك: (الهندان حفظتا درسهما) و (اجتهد) من نحو قولك: (البكران اجتهدا) أو قولك (الزينبان اجتهدتا) و (قاما) في نحو قولك: (المحمدان قاما بواجبهما) أو قولك: (الهندان قَامَتا بواجبهما).

**وه نموونه‌ی ڕاناوی جووتی غائب و نادیار جا نێر بن یا مێ بۆ نموونه‌کان ته‌ماشای سه‌ره‌وه بکه.**

---

(1)محمد: مبتدا (ضربَ) فعل ماضي ، والفاعل ضمير مستتر تقديرهُ هو (يعود إلى محمد) اخاهُ: مفعول به منصوب بالألف لأنه من الأسماء الخمسة وهو مضاف ، والهاء : مضاف اليه والجملة (ضرب أخاه) في محل رفع خبر (محمد).

وه رسته‌کانی تری ژماره (٨-٩) نزیکه‌ی هه‌موویان به‌م شێوه (إعراب) ده‌کرێن .

(2)المحمدان ضربا بكراً: المحمدان: مبتدا مرفوع بالألف لأنه مثنى ، ضربا: فعل ماضي مبني على الفتح، والألف : ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل، بَكراً: مفعول به منصوب بالفتحة، والجملة (ضربا بكراً) في محل رفع خبر المبتدا.

١١ ومثال ضمير الغائبين من جمع الذكور (ضَرَبُوا) من نحو قولك: (الرجال ضربوا أعداءهم) و (حفظوا) من نحو قولك: (التلاميذ حفظوا دروسهم) و (اجتهدوا) من نحو قولك: (التلاميذُ اجتهدُوا) .

١٢ ومثال ضمير الغائبات من جمع الإناث (ضَرَبْنَ) من نحو قولك: (الفتيات ضربن عدواتهن) وكذا حَفِظْنَ) من نحو قولك (النساء حفظن أماناتهن) وكذا (اِجْتَهَدْنَ) من نحو قولك: (البنات اجتهدن).

**١١- وه نموونەی راناوی کۆمەڵێ نادیاری نێر(ضَرَبُوا) له وەك (الرجال ضربوا أعداءهم) وه (حفظوا) له وەك: (التلاميذ حفظوا دروسهم) و (اجتهدوا) له وەك:(التلاميذُ اجتهدُوا) .**

**١٢ -وه نموونەی راناوی کۆمەڵێ نادیاری مێ (ضَرَبْنَ) له وەك: (الفتيات ضربن عدواتهن) و حَفِظْنَ) له وەك (النساء حفظن اماناتهن) و (اِجْتَهَدْنَ) له وەك (البنات اجتهدن)[1].**

**وه هەموو ئەو دوازده جۆرەی رابرد ئەو راناوەی که لەناویدان پێیان دەوترێ راناوی لکاو (الضمير المتصل) وه پێناسەکەی بریتیه لەوەی که قسه ناکرێ به ئەو دەست پێ بکات وه ناشکەوێته دوای (إلا) له حالەتی ئارەزوو لێ بوون ، ( تەنها له زەرورەتی شیعردا نەبێت ناکەوێته دوای (إلاّ)**

**بۆ نموونه تائی (ضربتُ) ناتوانی به تایەکه دەست به قسه بکەی وه ناشبێ بڵێ ی (ما ضربَ إلاّ تُ)**

---

(1)البناتُ: مبتدا (اجتهدنَ) فعل ماضي مبني على السكون ، والنون : ضمير مبني على الفتح في محل رفع فاعل، والجملة (إجتهدن) في محل رفع خبر البنات.

ومثلها يأتي في نوع آخر من الضمير يسمى " الضمير المنفصل " وهو: الذي يبتدأ به ويقع بعد " إلا " في حالة الاختيار، تقول " ما ضرب إلا أنا " و " ما ضرب إلا نحن " و " ما ضرب إلا أنت "، " وما ضرب إلا أنتِ "، " وما ضرب إلا أنتما "، " وما ضرب إلا أنتم "، " وما ضرب إلا أنتن "، " وما ضرب إلا هو "، " وما ضرب إلا هي "، " ما ضرب إلا هما "، " ما ضرب إلا هم "، " ما ضرب إلا هن " وعلى هذا يجري القياس. وسيأتي بيان أنواع الضمير المنفصل بأوسع من هذه الإشارة في باب المبتدأ والخبر .

**وە وێنەی ڕاناوی لکاو (ضمیر متصل) جۆرێکی تر هەیە پێ ی دەوترێ راناوی جیاکراوە (الضمیر المنفصل) ئەم جۆرەی دووەمە دەتوانی بە ئەو دەست پێ بکەی وە دەشکەوێتە دوای (إلاّ) لەهەر کاتێك کە ئارەزووت لێ هەبێت (بەبێ ئەوەی بە ناچاری بێت) دەڵێی (ما ضَرَبَ إلاّ انا)[1]. بۆ نموونەکانی تر تەماشای دەقەکەی سەرەوە بکە.**

**وە هەروەها لە باسی (المبتدأ والخبر) بە درێژتر باسی جۆرەکانی (الضمیر المنفصل) دەکەین.**

---

(1)**ما ضربَ الاّ انا: ما: نافية ، ضربَ: فعل ماضي مبني على الفتح، إلاّ: اداة استثناء ملغاة، انا: ضمير منفصل مبني على السكون في محل رفع فاعل..**

# تدريب على الإعراب

إعرب الجمل الآتية:

حضر محمد، سافر المرتضى، سيزورنا القاضي، أقبل أخي .

## الجواب

١ . حضر محمد : (حضر): فعل ما ض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب، محمد: فاعل مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره .

٢ . سافر المُرْتَضَى: (سافر): فعل ماض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب،

المرتضى: فاعل مرفوع وعلامة رفعه ضمة مقدرة على الألف منع من ظهورها التعذر.

٣ . سيزورنا القاضي:(سيزورنا): السين حرف دال على التنفيس، يزور: فعل مضارع مرفوع لتجرده من الناصب والجازم، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، ونا: ضمير مفعول به مبني على السكون في محل نصب، والقاضي فاعل مرفوع، وعلامة رفعه ضمة مقدرة على الياء منع من ظهورها الثقل .

٤ . أقبل أخي (أقبل) : فعل ماض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب، وأخ: فاعل مرفوع، وعلامة رفعه ضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها اشتغال المحل بحركة المناسبة، وأخ مضاف وياء المتكلم ضمير مضاف إليه مبني على السكون في محل جر .

## باب المفعول الذي لم يسم فاعله /

## ئەو (مفعول)ەی کە ناوی فاعیلەکەی نەهێنراوە

| |
|---|
| قال: وهو: الاسم، المرفوع، الذي لم يذكر معه فاعله . |

**دانەر دەڵێ : (نائب فاعل) ناوێکی مەرفوعە ، ئەوەیە کە ناوی فاعیلەکەی لەگەڵ دا نەیهێنراوە.**

## النائب عن افاعل

وأقول: قد يكون الكلام مؤلفاً من فعل وفاعل ومفعول به، نحو (قطع محمود الغصن) ونحو (حفظ خليل الدرس) ونحو (يَقطَعُ إبراهيمُ الغُصْنَ)، و : (يَحفظ عَليّ الدَّرْسَ).

وقد يحذف المتكلم الفاعل من هذا الكلام ويكتفي بذكر الفعل والمفعول، وحينئذ يجب عليه أن يغير صورة الفعل، ويغير صورة المفعول أيضاً، أما تغير صورة الفعل فسيأتي الكلام عليه.

وأما تغيير صورة المفعول فإنه ب أن كان منصوباً يصيره مرفوعاً، ويعطيه أحكام الفاعل: من وجوب تأخيره عن الفعل، وتأنيث فعله له إن كان مؤنثاً، وغير ذلك، ويسمى حينئذ " نائب الفاعل " أو " المفعول الذي لم يسم فاعله " .

## جێگری فاعل

وه دهڵێم: زۆر جار وادهبێت (كلام) پێك دێت له فیعل و فاعیل و (مفعول به) وهك (قطع محمود الغصن)[1] (حفظ خلیل الدرس) (يَقطَعُ إبراهيمُ الغُصْنَ)، (يَحفظ عَليّ الدَّرْسَ).

جاری واههیه قسهكهر فاعیل لهو قسهیه لادهبا ، تهنها ناوی فیعل و (مفعول به) دههێنێ ، ئهو كاته پێویسته لهسهری كه شێوهی فیعلهكه بگۆڕێ ، جا گۆڕینی شێوهی فیعلهكه لهمهودوا باسی دهكهین.

وه گۆڕینی شێوهی (مفعول)هكه ، لهدوای ئهوهی كه (منصوب) بوو دهیگۆڕێ بۆ مهرفوع وه یاساكانی فاعیلی پێ دهدات لهوهی كه دهبێت لهدوای فیعل بێت ، وه فیعلهكهی بۆ (مؤنث) بكهی.

ئهگهر ئهو (مؤنث) بوو ، وه جگه لهوانهش ، ئهو كاته ناوی لێ دهنرێ (نائب فاعل) یا ئهو (مفعول) هی كه ناوی فاعیلهكهی نههێنراوه.

---

(1)قطع: فعل ماض، محمود: فاعل، الغصن: مفعول به.

# تغيير الفعل بعد حذف الفاعل /

# گۆڕانی فیعل لەدوای لابردنی فاعیل

قال: فإن كان الفعل ماضياً ... ضُمَ أَوَلَهُ، وَكُسِرَ ما قبل آخره وإن كان مضارعاً ضم أوله وفتح ما قبل آخره .

أقول: ذكر المصنف في هذه العبارات التغييرات التي تحدث في الفعل عند حذف فاعلهوإسناده إلى المفعول. وذلك أنه إذا كان الفعل ماضياً ضم أوله وكسر الحرف الذي قبل آخره، فتقول: (قُطِعَ الغُصْنُ) و (حُفِظَ الدَّرْسُ).

وإن كان الفعل مضارعاً ضم أوله وفتح الحرف الذي قبل آخره، فتقول (يُقطَع الغُصْنُ)، (ويُحفَظُ الدَّرْسُ).

**دانەر دەڵێ: ئەگەر فیعلەکە (ماضي) بوو، پیتی یەکەمی بۆردار دەکریٚ وە پیتی پێش ئاخیری کەسرەدار دەکریٚ، وە ئەگەر (مضارع) بوو ، پیتی یەکەمی بۆردار دەکریٚ وە پیتی پێش ئاخیری فەتحەدار دەکریٚ.**

**دەڵێم: دانەر باسی ئەوەی کردووە لەم عیبارەتانە ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر فیعلدا دێت و لەو کاتەی کە فاعیلەکەی لێ لادەبریٚ وە دەخرێتە پاڵ (مفعول بە) ئەو کاتە ئەگەر (ماض) بێت پیتی یەکەمی بۆردار دەکرێت وە پیتی پێش کۆتایی کەسرەدار دەکرێت دەڵیٚ ی :**

(قُطِعَ الغصنُ) [1] (حُفِظَ الدرس)

وه ئەگەر فیعلەكەش (مضارع) بوو پیتی یەكەمی بۆردار دەكریّ و پیتی پێش ئاخیری فەتحەدار دەكریّ دەڵیّ ی (يُقطَع الغُصنُ) [2]، (ويُحفَظُ الدَّرْسُ).

---

(1)واته لقه دارەكه بڕدرا، قُطع : فعل ماض مبني للمجهول مبني على الفتح ، الغصن: نائب فاعل مرفوع بالضمة.

(2)واته: لقه دارەكه دەبڕدریّ ، يقطع : فعل مضارع مبني للمجهول مبني على الفتح، الغصنُ: نائب فاعل مرفوع بالضمة.

# أقسام نائب الفاعل / بەشەکانی جێگری فاعل

قال: وهو على قسمين: ظاهر، ومضمر.

فالظاهر نحو قولك (ضُرب زيد)، (يُضرب زيد)، (أُكرم عمرو)، (يُكرم عمرو).

والمضمر اثنا عشر، نحو قولك (ضربتُ)[1]، و(ضُربنا)، و(ضُربت)، و(ضربتِ)، و(ضربتما)، و(ضربتم)، و(ضُربتُم)، و(ضُربتن)[2]، و(ضُرب)[3]، و(ضربت)، و(ضُربا)، و(ضُربوا)، و(ضُربن).

أقول: ينقسم نائب الفاعل ـ كما انقسم الفاعل ـ إلى:

١ -ظاهر، و٢ مضمر، والمضمر إلى أ متصل وب منفصل .

وأنواع كل قسم من الضمير اثنا عشر: اثنان للمتكلم، وخمسة للمخاطب، وخمسة للغائب، وقد ذكرنا تفصيل ذلك كله في باب الفاعل، فلا حاجة بنا إلى تكراره هنا.

**دانەر دەڵێ: (نائب فاعل) دابەش دەبێت بۆ دووبەش : ئاشكراو شاراوە ئاشكرا وەك (ضُرب زيد)، (يُضرب زيد)، (أُكرم عمرو)، (يُكرم عمرو).**

**وە شاراوەش دوازدەنە : بۆ نموونەكان تەماشای دەقەكەی سەرەوە**

---

(1) **ضُربتُ: فعل ماض مبني للمجهول مبني على السكون (والتاء) ضمير متصل مبني على الضم في محل رفع نائب فاعل.**

(2) **ضُربتُنَّ: فعل ماضي مبني للمجهول مبني على السكون (تُنَّ) ضمير مبني على الفتح في محل رفع نائب فاعل .**

(3) **ضُرب: نائب فاعله ضمير مستتر تقديره هو.**

**بکه.**

**وه دهڵێم: : (نائب فاعل) دابهش دهبێت ههروهکو فاعل دابهش بوو بۆ ئاشکراو شاراوه، وه شاراوهش بۆ لکاوو سهربهخۆ ، وه ههموو جۆرهکانی ڕاناو دوازدهن : دوو بۆ قسهکهره ، پێنج بۆ قسه لهگهڵ کراوه ، وه پێنجیش بۆ نادیارو غائیبه ، ئهوهشمان له باسی فاعیل روون کردهوه ، لێرهدا پێویست ناکات دووبارهی بکهینهوه.**

## تدريب على الإعراب

إعرب الجملتين الآتيتين: يُحتَرمُ العالم، أُهِينَ الجَاهِلُ .

### الجواب

١ . يُحتَرمُ: فعل مضارع مبني للمجهول، مرفوع لتجرده من الناصب والجازم، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، العالم: نائب فاعل، مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة .

٢ . أُهِينَ: فعل ماض مبني للمجهول، مبني على الفتح لا محل له من الإعراب .

الجاهل: نائب فاعل، مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة .

# باب المبتدأ[1] والخبر / باسی (مبتدأ) و (خبر)

قال: المبتدأ : هو الاسم المرفوع العاري عن العوامل اللفظية، والخبر: هو الاسم المرفوع المسند إليه، نحو قولك (زيد قائم)، (الزيدان قائمان)، (الزيدون قائمون) .

**دانەر دەڵێ: (مبتدا) ناوێکی مەرفوعە رووتە لەهەموو عامیلێکی لەفزی ، خەبەریش ئەویش ناوێکی مەرفوعە دەدرێتە پاڵ (مبتدا) وەك (زید قائم)، (الزیدان قائمان)، (الزیدون قائمون)[2] .**

وأقول: المبتدأ عبارة عما اجتمع فيه ثلاثة أمور،

الأول: أن يكون اسماً، فخرج عن ذلك الفعل والحرف.

والثاني: أن يكون مرفوعاً، فخرج بذلك المنصوب والمجرور بحرف جر أصلي.

والثالث: أن يكون عارياً عن العوامل اللفظية.

ومعنى هذا أن يكون خالياً من العوامل اللفظية مثل الفهل ومثل (كان) وأخواتها، فإن الإسم الواقع بعد (كان) أو إحدى أخواتها يسمى (اسم كان) ولا يسمى (مبتدأ) .

ومثال المستوفي هذه الشروط الثلاثة (محمد) من قولك: (مُحَمَّدٌ حَاضِرٌ) فإنه اسم مرفوع لم يتقدمه عامل لفظي.

---

(1)مبتدا: دەست پێ کراو (خبر) دەنگ و باس.

(2)الزيدون : مبتدا مرفوع بالواو لأنه جمع مذكر سالم (قائمون) خبر مرفوع بالواو لأنه جمع مذكر سالم..

**وه دهڵێم: (مبتدا) بریتیه لهوهی كه سێ شتی لێ بێته دی :**

**یهكهم: دهبێ ناو بێت ، كهواته فیعل و حهرفی لێ دهردهچێ .**

**دووهم: دهبێ مهرفوع بێت: كهواته بهوه دهردهچێ ئهوهی كه (منصوب)ه وه ئهوهش كه مهجروره به حهرفی جهری ئهسڵی (كهواته ئهوهی به حهرفی جهری زیاده یا (شبیه بالزائد) ئهوه ناگرێتهوه، وهك : بحسبك درهم، ربَّ رجلٍ كریم قابلني، واته : حسبُك درهم، بائهكهی زائده، ربّ: حرف جر شبیه بالزائد، حسبكِ: في محل رفع مبتدا).**

**سێ یهم: وهدهبێ رووت بێت له عامیلی لهفزی ، مانای ئهوه واته دهبێ هیچ عامیلهكی لهفزی نهچووبێته سهر وهك فیعل وه وهك (كان) و خوشكهكانی ، ئهو ناوهی كه دهكهوێته دوای فیعل دهبێته فاعیل یا جێگری فاعل ، لهسهر ئهوهی كه رابرد ، وه ئهو ناوهی دهكهوێته دوای (كان) یا یهكێك له خوشكهكانی ناوی دهنرێ به (اسم كان) ناو نانرێ (مبتدا) وه نموونه لهسهر ئهوهی كه ئهم سێ شتهی باس كرا تیایدا بێت (محمد) كه دهڵێ ی (محمد حاضِرٌ) كه ناوێكی مهرفوعه هیچ عامیلێكی لهفزی پێش نهكهوتووه.**

والخبر: هو الاسم المرفوع الذي يسند إلى المبتدأ ويحمل عليه، فيتم به معه الكلام، ومثاله

(حاضر) من قولك: (مُحَمَّدٌ حَاضِرٌ).

**وه خهبهر : ناوهێكی مرفوعه كه دهدرێته پاڵ (مبتدا) وه دهخسترێته سهر ئهو ، به ئهو قسه تهواو دهبێت ، وه نموونه لهسهری (حاضر) كه دهڵێی (محمدٌ حاضرٌ).**

وحكم كل من المبتدأ والخبر الرفع كما رأيت، وهذا الرفع

١ - إما أن يكون بضمة ظاهرة، نحو (الله ربنا)، (محمد نبينا)

٢ - وإما أن يكون مرفوعاً بضمة مقدرة للتعذر نحو (موسى مصطفى من الله) ونحو (ليلى فضلى النساءِ)[١] .

٣ - وإما أن يكون بضمة مقدرة منع من ظهورها الثقل نحو (القاضي هو الآتي)

٤ - وإما أن يكون مرفوعاً بحرف من الحروف التي تنوب عن الضمة، نحو (المجتهدان فائزان).

**وه یاسای (مبتدا) وه خەبەر هەردووکیان مەرفوعن هەروەکو بینیت ، وه ئەو رەفعەش :**

**١- یا بۆرێکی ئاشکرایه وەك (اللهُ ربُّنا) و (محمدٌ نبِيُّنا)[٢] .**

**٢- یا مەرفوعه به بۆرێکی تەقدیرکراو و مەزەندە کراو (للتعذر) وەك (موسى مصطفى من الله)[٣] ونحو (ليلى فضلى النساءِ).**

**٣- یا مەرفوعه به بۆرێکی مەزەندە کراو لەبەر قورس (ثقل) وەك (القاضي هو الآتي) الآتي : خبر مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة على آخره منع من ظهورها الثقل .**

**٤- یا مەرفوعه به پیتێك کە لەبری بۆر دادەنرێ و جێی بۆر**

---

**(1)ليلى: مبتدا مرفوع بضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها التعذر ، فضلى: خبر مرفوع بضمة مقدرة على آخره منه من ظهورها التعذر وهو مضاف، (النساء) مضاف إليه.**

**(2)محمد: مبتدا ، نبينا: خبر مرفوع بالضمة وهو مضاف و (نا) مضاف إليه.**

**(3)موسى مصطفى من الله : واته: موسى هەڵبژێردراوه لەلایەن خواوه.**

**دەگرێتەوە وەك (المجتهدان فائزان)[١].**

ولابد من المبتدأ والخبر أن يتطابقا في الإفراد، نحو (محمد قائم) والتثنية نحو (المحمدان قائمان) والجمع نحو (المَحَمدُونَ قائمون)، وفي التذكير كهذه الأمثلة. وفي التأنيث نحو

(هِندٌ قائِمَةٌ)، (الهِندَانِ قائِمَتانِ)، (الهِنداتُ قائماتٌ).

**وە دەبێ (مبتدأ) و خەبەر وەكو يەك بن لە رووی تاكێتی وەك (محمد قائم) وە لە رووی جووتی وەك (المحمدان قائمان) وە لە رووی كۆیەتی وەك (المحمدون قائمون) وە لە رووی نێری ئەمە وەك ئەو سێ نموونەی رابرد ، وە لە رووی مێیەتی وەك (هِندٌ قائِمَةٌ)، (الهِندَانِ قائِمَتانِ)، (الهِنداتُ قائماتٌ)[٢].**

---

**(1) المجتهدان: مبتدا مرفوع بالألف لأنه مثنى (فائزان) خبر مرفوع بالألف لأنه مثنى.**

**(2) الهنداتُ: مبتدا مرفوع بالضمة (قائماتٌ) خبر مرفوع بالضمة لأنه جمع مؤنث سالم.**

# أقسام المبتدأ / بەشەكانی (مبتدأ)

قال: والمبتدأ قسمان: ١ - ظاهر و٢ - مضمر.
فالظاهر ما تقدم ذكره، والمضمر اثنا عشر، وهي: (أَنَا)، و(نَحنُ)، و(أَنتَ)، و(أَنتِ)، و(أَنتُمَا)، و(أَنْتُم)، و(أَنْتُنَ)، و(هُوَ)،وَ(هِيَ)، وَ(هُمَا)، وَ(هُمْ)، وَ(هُنَ)، نحو قولك: (أنِا قائِمٌ)، (نَحْنُ قَائِمُونَ)[1]. وما أشبه ذلك .

وأقول: ينقسم المبتدأ إلى قسمين: الأول الظاهر، والثاني: المضمر، وقد سبق في باب الفاعل تعريف كل من الظاهر والمضمر.

**دانەر دەڵێ : (مبتدا) دوو بەشە : ١- ئاشكرا ٢- شاراوە[٢].**

**ئاشكرا باس كرا ، شاراوەكانیش دوازدەنە كە لەدەقەكەی سەرەوە باس كراوە وە دەڵێم : (مبتدا) دابەش دەبێت بۆ دوو بەش : یەكەم : ئاشكرا ، دووەم: شاراوە ، وە لەبابی فاعل پێناسەی هەردووكیانمان كردووە.**

فمثال المبتدأ الظاهر (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله) و (عَائِشَةُ أُمُّ المُؤمنينَ) .

والمبتدأ المضمر اثنا عشر لفظاً .

الأول: (أنا) للمتكلم الواحد، نحو (أنا عبدُ الله) .

والثاني: (نحن) للمتكلم المتعدد أو الواحد المعظم نفسه، نحو (نحن قائمون).
والثالث: (أنتَ) للمخاطب المفرد المذكر، نحو (أَنْتَ فَاهِمٌ).

---

**(1)نحنُ: ضمير منفصل مبني على الضم في محل رفع مبتدا، (قائمون) خبر مرفوع بالواو لِأَنَهُ جمع مذكر سالم.**

**(2)شاراوە واتە (مضمر) یانی ئەوانەی بەشێوەی (ضمير) هاتوون.**

والرابع: (أنتِ) للمخاطبة المفردة المؤنثة، نحو (أَنتِ مُطِيعَةٌ).

والخامس: (أنتما) للمخاطبين مذكرين كانا أو مؤنثين، نحو (أَنتُمَا قائمان) و (أَنْتُما قائمتانِ).

والسادس: (أنتم) لجمع الذكور المخاطبين، نحو (أَنتُمْ قَائِمُونَ) .

والسابع: (أنتن) لجمع الإناث المخاطبات، نحو (أَنْتُنَ قَائماتٌ).

والثامن: (هو) للمفرد الغائب المذكر، نحو (هُوَ حَاضِرٌ) .

والتاسع: (هي) للمفردة المؤنثة الغائبة، نحو (هي مُسَافِرَةٌ).

والعاشر: (هما) للمثنى الغائب مطلقاً، مذكراً كان أو مؤنثاً نحو (هما قائمَانِ)، (هما قائِمَتَانِ) .

والحادي عشر: (هم) لجمع الذكور الغائبين، نحو " هُمْ قَائِمُون).

والثاني عشر: (هن) لجمع الإناث الغائبات، نحو (هُنَّ قَائمات) ، وإذا كان المبتدأ ضميراً فإنه لا يكون إلا بارزاً منفصلاً، كما رأيت.

**نموونەی (مبتدا) ی ئاشکرا (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله) و (عَائِشَةُ أُمُّ المُؤمنِينَ)[1]. وە (مبتدا) ی شاراوە دوازدەیە:**

**١- (انا) بۆ قسەکەری تاك، وەك (انا عبدُ الله)[2].**

**٢- (نحن) بۆ قسەکەری کۆ ، یا بۆ یەك کەس کە خۆی گەورە بکات وەك (نحنُ قائمون).**

**٣- (انتَ) بۆ قسەلەگەڵداکراوی تاکی نێرە وەك (انتَ فاهمٌ).**

---

(1)عائشة: مبتدا (أمُّ) خبر (المؤمنين) مضاف إليه.

(2)انا: ضمير منفصل مبني على السكون في محل رفع مبتدا (عبدُ) خبر (الله) لفظ الجلالة ، مضاف إليه.

٤- (انتِ) بۆ قسەلەگەڵداکراوی مێ یە وەك (انتِ مطيعةٌ)[١].

٥- (انتما) بۆ دوو کەسی قسەلەگەڵداکراوە جا نێر بن یا مێ وەك (انتما قائمان).

٦- (انتم) بۆ کۆمەڵێك نێری قسەلەگەڵداکراوە وەك (انتم قائمون).

٧- (انتُنَ) بۆ کۆمەڵێك مێ ی قسەلەگەڵداکراوە وەك (انتنَّ قائماتٌ)[٢].

٨- (هو) بۆ تاکی ئامادە نەبووی تاکە وەك (هي حاضر).

٩- (هی) بۆ تاکی نادیاری مێیە وەك (هي مسافرة).

١٠- (هما) بۆ جووتی نادیارە لەنێر یا لە مێ وەك (هما قائمان) هما قائمتان).

١١- (هم) بۆ کۆمەڵێ نێری غائبە وەك (هم قائمون)[٣].

١٢- (هُنَّ) بۆ کۆمەڵێ مێی غائیبە وەك (هُنَ قائمات).

وە ئەگەر (مبتدا) راناو بوو ئەو کاتە ئاشکراو سەربەخۆ دەبێت هەروەکو بینیت.

---

(1) انتِ: ضمير منفصل مبني على الكسر في محل رفع مبتدأ (مطيعة) خبر.

(2) انتنَ: ضمير منفصل مبني على الفتح في محل رفع مبتدأ (قائمات) خبر مرفوع بالضمة.

(3) هم: ضمير منفصل مبني على السكون في محل رفع مبتدأ (قائمون) خبر مرفوع بالواو لأنه جمع مذكر سالم.

# أقسام الخبر / بەشەکانی خەبەر

قال: والخبر قسمان: ١ -مفرد و٢ -غير مفرد، فالمفرد نحو (زيد قائم) وغير المفرد أربعة أشياء: ١ -الجار والمجرور، و٢ -الظرف، و٣ -الفعل مع فاعله، و٤ -المبتدأ مع خبره، نحو قولك: (زيد في الدار)، و(زيد عندك)، و(زيد قائم أبوه)، و(زيد جاريته ذاهبة).

وأقول: ينقسم الخبر إلى قسمين: الأول خبر مفرد، والثاني خبر غير مفرد.

والمراد بالمفرد هنا: ما ليس جملة ولا شبيهاً بالجملة، نحو (قائم) من قولك (محمد قائم).

**دانەر دەڵێ : خەبەر دوو بەشە : ١- تاك ٢- غەیری تاکیش ، تاك وەك (زید قائم) وە بێجگە لە تاکیش چوارشتن: ١- جارو مەجرور ٢- (ظرف) ٣- فیعل لەگەڵ فاعیلەکەی ٤- (مبتدا) لەگەڵ خەبەرەکەی وەك (زید في الدار)[1] (زید عندك) (زید قام ابوه) (زید جاریَتُهُ ذاهبة).**

**وە دەڵێم : خەبەر دابەش دەبێت بۆ دووبەش : یەکەم خەبەرێکی تاك ، دووەم : خەبەری غەیری تاك.**

**مەبەست بە تاك لێرەدا ئەوەیە کە رستە نەبێت ، وە بە رستەش نەچێت ، وەك ووشەی (قائم) لە (محمد قائم).**

---

(1)بۆ (إعراب) ی لەم جۆرانە سەیر لەکۆتایی ئەم بابەتە بدە .

وغير المفرد نوعان: جملة وشبه جملة

والجملة نوعان: " جملة اسمية، وجملة فعلية ".

فالجملة الاسمية: ما تألف من مبتدأ وخبر نحو (أَبُوهُ كَرِيمٌ) من قولك (مُحَمَّدٌ أَبُوهُ كَرِيمٌ).

والجملة الفعلية: ما تألفت من فعل وفاعلأو نائبه، نحو (سَافَرَ أَبُوهُ) من قولك (مَحَمَّدٌ سَافَرَ أَبُوه) ونحو (يُضْرَبُ غُلَامُهُ) من قولك (خَالِدٌ يَضْرَبُ غُلامُهُ).

**وه خەبەر جگە لەتاك دوو جۆرە : رستە وە وێچوو بە رستە (جملة) دوو جۆرە : رستەی ناوی ، رستەی فیعلی.**

**جوملەی (اسم) ی ئەوەیە کە لە (مبتدا) و خەبەر پێك هاتبێ وەك (ابوه كريم) لە (محمد ابوه كريم) محمد: مبتدا، ابو: مبتدا، الهاء: مضاف إليه ، كريم :خبر ، والجملة الإسمية (ابوه كريم) خبر محمد.**

**وە جوملەی فیعلی : ئەوەیە لە فیعل و فاعیل یا جێگری فاعل پێك هاتبێ ، وەك (سافر أبوهُ) لە (محمد سافر أبوه) وە وەك (يضربُ غلامهُ) لە (خالد يضربُ غلامهُ) خالد: مبتدا، يضربُ: فعل مضارع مبني للمجهول مرفوع بالضمة، غلام: نائب فاعل ، الهاء : مضاف إليه ، والجملة الفعلية (يضربُ غلامُهُ) في محل رفع خبر خالد.**

فإن كان الخبر جملة فلابد له من رابط يربطه بالمبتدأ إما ضمير يعود إلى المبتدأ كما سمعت في الأمثلة وإما اسم إشارة نحو (مُحَمَّدٌ هَذاَ رَجُلٌ كَرِيمٌ).

وشبه الجملة نوعان أيضاً، الأول: الجار والمجرور، نحو (في المسجد) من قولك (عَلِيٌّ فِي المَسْجِدِ " .

والثاني: الظرف، نحو (فَوْقَ الغُصْن) من قولك (الطَّائِرُ فَوْقَ الغُصْن).

ومن ذلك تعلم أن الخبر على التفصيل خمسة أنواع: ١- مفرد، و٢- جملة فعلية، و٣- جملة اسمية، و٤- جار ومجرور، و٥- ظرف.

**ئەگەر خەبەرەكە جوملە بوو ، دەبى پەيوەنديەك هەبێت بيبەستێتەوە بە (مبتدا) جا ئەو پەيوەنديیە راناوێك بێت بۆ (مبتدا) بگەڕێتەوە وە هەروەكو بيستت ، يا (اسم إشارة) بێت وەك (محمد هذا رجل كريم)، وە (شبه جملة) دوو جۆرە : يەكەم: جار وە مجرور وەك (في المسجد) لە (علي في المسجد) دووەم: (ظرف) وەك (فوق الغصن) لە (الطائر فوقَ الغصن).**

**وە لەوە دەزانى كە خەبەر بە درێژى پێنج جۆرە ١- مفرد ٢- جملة فعلية ٣- جملة اسمية ٤- جار و مجرور ٥- ظرف.**

## تدريب على الإعراب

إعرب الجمل الآتية:

" محمد قائم، محمد حضر أبوه، محمد أبوه مسافر، محمد في الدار، محمد عندك .

### الجواب

١ . محمد قائم : محمد: مبتدأ مرفوع بالابتداء، وعلامة رفعه ضمة في آخره، قائم: خبر لمبتدأ مرفوع بالمبتدأ، وعلامة رفعه ضمة ظاهرة في آخره .

٢ . محمد حضر أبوه : محمد: مبتدأ، حضر: فعل ماض مبني على لبفتح لا محل له من الإعراب .

أبو: فاعل حضر مرفوع بالواو نيابة عن الضمة لأنه من الأسماء الخمسة، وأبو مضاف، والهاء مضاف إليه، مبني على الضم في محل خفض، والجملة من الفعل والفاعل في محل رفع خبر المبتدأ، والرابط بين المبتدأ والخبر هو الضمير الواقع مضافاً إليه في قولك (أبوه).

٣ . محمد أبوه مسافر: (محمدٌ): مبتدأ أول مرفوع بالضمة الظاهرة، و(أبو): مبتدأ ثان مرفوع بالواو نيابة عن الضمة لأنه من الأسماء الخمسة، و(أبو) مضاف، و(الهاء) مضاف إليه (مسافر): خبر المبتدأ الثاني وجملة المبتدأ الثاني وخبره في محل رفع خبر المبتدأ الأول، وارابط بين هذه الجملة والمبتدأ الأول الضمير الذي في قولك (أبوه) .

٤ . محمد في الدار: (محمد): مبتدأ، (في الدار): جار ومجرور متعلق بمحذووف خبر المبتدأ.

٥ . محمد عندك : (محمد): مبتدأ، (عند): ظرغ مكان متعلق بمحذوف خبر المبتدأ، و(عند): مضاف، و(الكاف) ضمير مخاطب مضاف إليه مبني على الفتح في محل خفض.

# باب العوامل الداخله على المبتدأ والخبر /

# باسی ئەو عامیلانەی دەچنە سەر (مبتدأ) و خەبەر

قال:"وهي ثلاثة أشياء: ١ -كَانَ وَأَخَواتُها، و٢ -إِنَ وَأَخَوَاتُهَا، و ٣ -ظَنَنتُ وَأَخَوَاتُهَا.

**دانەر دەڵێ : ئەو عامیلانەی دەچنە سەر (مبتدا) و خەبەر سێ شتن ١- (كان)و خوشكەكانی ٢- (إنَّ) و خوشكەكانی ٣- (ظننتُ) و خوشكەكانی.**

## (نواسخ[1] المبتدأ والخبر)

وأقول: قد عرفت أن المبتدأ والخبر مرفوعان، واعلم أنه قد يدخل عليهما أحد العوامل اللفظية فيغير إعرابهما، وهذه العوامل التي تدخل عليهما فتغير إعرابهما. بعد تتبع كلام العرب الموثوق به. على ثلاثة أقسام :

القسم الأول: يرفع المبتدأ وينصب الخبر، وذلك ("كان" وأخواتها)، وهذا القسم كله أفعال،نحو(كان الجَوُّ مُكْفَهِراً) .

القسم الثاني: ينصب المبتدأ ويرفع الخبر، عكس الأول، وذلك ("إن" وأخواتها)

---

(1)نسخ: لە زمانی عەرەبیدا بەسێ مانایان هاتووە : ١- لابردن (الإزاله) ٢- گۆڕین (تبديل) ٣- گواستنەوە(نقل)، خوا دەربارەی مانای سێ یەم دەفەرموێ : ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ الجاثية: ٢٩ ، واتە : ئێمە ئەی كافرەكان ئەو كردەوانەی كە دەتانكرد لە دونیادا هەر ئەو كاتی نوسخەمان لێ دەگرتەوەو (استنساخ) مان دەكرد، (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) مامۆستا عەلی باپیر.

وهذا القسم كله أحرف، نحو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ .

القسم الثالث: ينصب المبتدأ والخبر جميعاً، وذلك ("ظننت" وأخواتها)، وهذا القسم كله أفعال، نحو (ظَنَنْتُ الصَّدِيقَ أَخاً).

وتسمى هذه العوامل (النواسخ) لأنها نسخت حكم المبتدأ والخبر، أي: غيرته وجددت لهما حكماً آخر غير حكمهما الأول.

## لابەرەكانی (مبتدأ) و خەبەر

**وە دەڵێم : زانیت (مبتدا) و خەبەر مەرفوعن ، وە بزانە كە یەكێك لە عامیلە لەفزیەكان دەچێتە سەری (إعراب) ی دەگۆڕێ ، وە ئەو عامیلانەش كە دەچنە سەریان (إعراب)یان دەگۆڕن – لە دوای بەدواداگەڕان لە قسەی ئەو عەرەبانەی كە جێی متمانەن – دابەش دەبن بۆ سێ بەش :**

**بەشی یەكەم: (مبتدا) ی مەرفوع دەكات ، و خەبەری (منصوب) دەكات ئەوانەش (كان) و خوشكەكانیەتی ، ئەو بەشەش هەموویان فیعلن وەك (كان الجو مكفهراً)**

**كان: فعل ماض ناقص (الجو) اسم كان مرفوع بالضمة (مكفهراً) خبر كان منصوب بالفتحة.**

**بەشی دووەم: (مبتدا) ی (منصوب) دەكات وە خەبەری مەرفوع دەكات پێچەوانەی بەشی یەكەم ئەوانەش (إنَّ) و خوشكەكانیەتی، ئەو بەشەش هەموویان حەرفن وەك خوا دەفەرموێ:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ

حَكِيمٌ ﴾[1].

{إنَّ: حرف توكيد ونصب (الله) لفظ الجلالة ، اسم إنَّ منصوب بالفتحة ، (عزيز) خبر إنَّ مرفوع بالضمة (حكيم) خبر إنَّ ثان مرفوع بالضمة}.

بەشی سێ یەم : (مبتدا) و خەبەری پێکەوە (منصوب) دەکەن ، ئەوانەش (ظننتُ) وە خوشکەکانیەتی ، وە ئەم بەشەش هەموویان فیعلن وەك (ظننتُ الصديق اخاً) {(ظننتُ) فعل ماضي مبني على السكون (التاء) ضمير متصل مبني على الضم في محل رفع فاعل (الصديقَ) مفعول أول لـ(ظنَ) منصوب بالفتحة (اخاً) مفعول به ثان} وە ئەو عاميلانە ناو دەبرێن بە گۆڕەر (نواسخ) لەبەر ئەوەی یاسای (مبتدا) و خەبەریان گۆڕی ، وە یاسایەکی نوێیان بۆ دروست کردن غەیری یاسای یەکەم.

(1)(التوبه – ٧١).

## كان وأخواتها / (كان) ەو خوشكەكانی

قال: فأما " كان " وأخواتها، فغنها ترفع الإسم، وتنصب الخبر، وهي: (كَانَ)، وَ(أمسَىَ)، وَ(أَصبَحَ)، وَ(أَضحَى)، وَ(ظَلَّ)، وَ(بَاتَ)، وَ(صَارَ)، وَ(لَيسَ)، وَ(مَا زَالَ)، وَ(مَا اِنْفَكَ)، وَ(مَا فَتِيءَ)، وَ(مَا بَرِحَ)، وَمَا دَامَ)، وما تصرف[1] منها نحو: (كَانَ)، وَ(يَكُونُ)، وَ(كُنْ)، وَ(أَصبَحَ)، وَ(يُصبِحُ)، وَ(أصبِحُ)، تقُوُل: (كَانَ زَيدٌ قَائِماً)، وَلَيسَ عَمر شَاخِصاً) وما أشبه ذلك .

وأقول: القسم الأول من نواسخ المبتدأ والخبر " كان " وأخواتها، أي نظائرها في العمل .

وهذا القسم يدخل على المبتدأ فيزيل رفعه الأول ويحدث له رفعاً جديداً، ويسمى المبتدأ (اسمه)، ويدخل على الخبر فينصبه، ويسمى (خبره).

**دانەر دەڵێ : (كان) و خوشكەكانی ناو مەرفوع دەكەن وە خەبەر (منصوب) دەكەن كە ئەمانەن (كان – أمسى – اصبح– ظلَّ– باتَ – صار – ليس– مازال– ما انفك– ما فتيء– ما برح– مادام) ئەوانەش كە دەگۆڕێن لەمانە وەك (كان – يكون – كُنْ)[2] (اصبح – يُصبح– إصْبِحْ) واتە جگە لە (ماضي) يان ئەگەر هەبێ هەمان كار دەكەن لەوانەی كە دەگۆڕێن.**

**دەڵێ ی (كان زيدٌ قائماً) (ليسَ عَمْرو) شاخصاً) وە ئەمەش كە لەمانە**

---

(1) تَصَرُّف: تبديل – تغيير– گۆڕان.

(2) كن جالساً: كن : فعل أمر ناقص، واسمه ضمير مستتر تقديره انت، جالساً: خبر كن منصوب بالفتحة.

**دەچن .**

**وە دەڵێم : بەشی یەکەم لە لابەرەکانی یاسای (مبتدا) و خەبەر (کان) و خوشکەکانی واتە هاو وێنەکانی لە کارکردن دا.**

**ئەم بەشە دەچنە سەر (مبتدا) رەفعی یەکەمی لێ لادەبا، رەفعێکی تری بۆ دروست دەکات، جا (مبتدا)ەکە ناو دەنرێ بە(إسمی) ئەو ، دەچنە سەر خەبەر (منصوب) ی دەکن وە ناو دەبرێ بە خەبەری ئەو**

## وهذا القسم ثلاثة عشر فعلاً :

الأول: " كان " وهو يفيد اتصاف الاسم بالخبر في الماضي، إمّا مع الانقطاع، نحو " كان محمد مجتهداً " أما مع الاستمرار، نحو " وكان ربك قديراً " .

الثاني: " أمسى " وهو يفيد اتصاف الاسم بالخبر في المساء، نحو " أمسى الجو بارداً "

الثالث: " أصبح " وهو يفيد اتصاف الاسم بالخبر في الصباح، نحو (أصبح الجو مكفَهِراً).

## ئەو بەشە (واتە (کان) و هاو وێنەکانی) سێزدە فیعلن:

**١- (کان) ناو بە خەبەرەکەی وەسف دەکات لە زەمانی رابردوو ، جا یا رابردوومکی پچڕاو وەك (کان محمد مجتهداً) واتە: موحەمەد پێشتر کۆشش کەر بوو ئێستا نەء، یا لەگەڵ بەردەوامی وەك خوا دەفەرموێ :**

﴿ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴾[1]، واته: وه پەروەردگارت هەمیشە بە دەسەلاّت و توانایە ، واتە: لە رابردوو و لە ئێستاو لە داهاتووشدا.

٢- (امسی) [2] ناو بەخەبەر وەسف دەکات لەکاتی ئێوارە وەك (امسی الجو بارداً) واتە: کاتی ئێوارە ئاوو هەوا سارد بوو.

٣- (اصبح) [3] ناو بەخەبەر وەسف دەکات لەکاتی بەیانی وەك (اصبح الجوُّ مکفهراً).

والرابع:" أضحى " وهو يفيد اتصاف الاسم بالخبر في الضحى، نحو (أَضْحى الطالِبُ نشِيطاً).

والخامس: " ظل " وهو وهو يفيد اتصاف الاسم بالخبر في جميع النهار، نحو ﴿ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا ﴾

والسادس: " بات " وهو يفيد اتصاف الاسم بالخبر في البيات، نحو (باتَ مُحَمَّدٌ مَسْرُوراً).

٤- (اضحی) ناو بەخەبەر وەسف دەکات لەکاتی چێشتەنگاو وەك (اضحی الطالبُ نشیطاً) واتە: قوتابییەکە لەکاتی چێشتەنگاودا چوست

---

(1) (الفرقان-٥٤) (وكان) الواو: حرف استئناف (كان) فعل ماض ناسخ مبني على الفتح (ربُك) اسم كان مرفوع بالضمة، الكاف: ضمير مبني على الفتح في محل جر مضاف إليه (قديراً) خبر كان منصوب بالفتحة.

(2) سيد سابق لە (فقه السنة) لە باسی (اذكار الصباح والمساء) دەڵێ (صبح) دەکەوێتە نێوانی بانگی بەیانی و رۆژهەلاّت وە (مساء) دەکەوێتە نێوانی عەسرو رۆژئاوابوون.

(3) جوّ: مناخ، ئاوو هەوا ، کەش و هەوا.

**و چالاك بوو.**

**[(ضحى) كاتەكەی دەست پێ دەكات لەدوای ڕۆژهەڵات بە (١٥) یان (٢٠) دەقیقە، تا دەوروبەری (١٥) دەقیقە پێش بانگی نیوەڕۆ دەمێنێ .**

**لەم نێوانەدا دوو تا هەشت ركات نوێژی چێشتەنگاو سوننەتە بكرێ].**

**٥- (ظلَّ) ناو بەخەبەر وەسف دەكات لەهەموو ڕۆژەكدا وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا ﴾[1] .**

**٦- (باتَ) ناو بەخەبەر وەسف دەكات لەكاتی شەودا وەك (بات محمد مسروراً) واتە: موحەمەد شەوی كردەوە بە شادومانی.**

والسابع: " صار " وهو يفيد تحول الاسم من حالته إلى الحالة التي هو عليها الخبر، نحو (صَار الطين إبْرِيقاً).

والثامن: " ليس " وهو يفيد نفي الخبر عن الاسم في وقت الحال، نحو (لَيسَ مُحَمَّدٌ فَاهماً).

والتاسع والعاشر والحادي عشر والثاني عشر: (ما زال)، و:(ما انفك)، و: (ما فتىء)، و: (ما برح)، وهذه الأربعة تدل على ملازمة الخبر للاسم حسبما يقتضيه الحالُ، نحو (مَا زَالَ إبْراهِيم مُنْكِراً)، و نحو: (ما برح عليٌّ صديقاً مُخْلِصاً).

والثالث عشر: (ما دام) وهو يفيد ملازمة الخبر للاسم أيضاً نحو (لا أعذِلُ

---

**(1) (الزخرف-١٧) (ظلَّ) فعل ماض ناقص، جواب الشرط مبني على الفتح (وجهُهُ) اسم ظلَّ مرفوع بالضمة ، الهاء : ضمير مبني على الضم في محل جر مضاف إليه ، (مسوداً) خبر ظلَّ منصوب بالفتحة.**

خَالِداً مَا دُمْتُ حيّاً).

**٧- (صار) ماناى گۆڕانى ناو لەبارو حالەتى خۆيدا بۆ ئەو حالەتەى كە خەبەرەكە ئاماژەى پىێ دەدات وەك (صارَ الطين ابريقاً) واتە: قوڕەكە بووە مەسينە.**

**٨- (ليس) نەفى خەبەر دەكات لەناو حالى ئێستادا ، وەك (ليس محمد فاهماً) ليس: فعل ماضي ناقص مبني على الفتح ، محمد: اسم ليس ، فاهماً: خبر ليس منصوب بالفتحة.**

**٩- ١٠-١١-١٢- (مازال – ما انفك– ما فَتِيء[1] – ما برِح) ئەم چوارە ماناى پەيوەست بوونى خەبەر دەدەنەوە بۆ ناو ، هەر چۆنێك حالەكە داخواز بكات وەك (مازال ابراهيمُ منكراً) (ما برح عليٌّ صديقاً مخلصاً) مخلصاً: صفة (وەدەش بێت ئەم حالە بەردەوام بێت) بەپێى حالەكە، جار وايە بەردەوام دەبێت جار وايە بەردەوام نابێت).**

**١٣- (مادام) ئەوەش ماناى پەيوەست بوونى خەبەر دەداتەوە بۆ ناو وەك (لا أعذِلُ خالداً ما دمت حياً) واتە: لۆمەى خالد ناكەم تا لە ژياندا مابم.**

**لا: حرف نفي (اعذل) فعل مضارع والفاعل انا (خالداً) مفعول (ما) حرف مصدري (دمتُ) فعل ماضي مبني على السكون (التاء) ضمير مبني على الضم في محل رفع اسم دام (حياً) خبر دام**

وتنقسم هذه الأفعال . من جهة العمل . إلى ثلاثة أقسام:

القسم الأول: ما يعمل هذا العمل . وهو رفع الاسم ونصب الخبر، بشرط تقدم

---

(1) **ما: حرف نفي مبني على السكون (فتيء) فعل ماض مبني على الفتح.**

" ما " المصدرية الظرفية عليه وهو فعل واحد وهو " دام "

القسم الثاني: ما يعمل هذا العمل بشرط أن يتقدم عليه نفي، أو استفهام، أو نهي، وهو أربعة أفعال، وهي: ١-" زَالَ "، و٢-"اِنْفَكَ "، و٣-" فَتِيءَ "، و٤-" بَرِحَ "

القسم الثالث: ما يعمل هذا العمل بغير شرط، وهو ثمانية أفعال، وهي الباقي.

**وه ئەم فيعلانە (كان واخواتها) لە رووی كاركردن دابەش دەبن بۆ سێ بەش:**

**بەشی يەكەم : ناو مەرفوع دەكات وە خەبەريش (منصوب) دەكات بە مەرجێ (ما)ی (مصدر)ی (ظرف) ی پێش بكەوێ ئەوەش يەك فيعلە كە (دام) يە.**

**(بۆ نموونە وەك پێشتر گوتمان (لا أعذلُ خالداً ما دمتُ حياً) واتە: لۆمەی خالد ناكەم (مُدَّةَ دوامي حياً) (مُدَّة) (مصدر)ە (دوام) (ظرف) زەمانە كەواتە (ما) لێرەدا مانای (مصدر) و (ظرفية) ی تيا دايە، وە لە پێش ئەم بابەتە ئەم رستەيەمان (إعراب) كردووە.**

**بەشی دووەم: ناو مەرفوع دەكەن خەبەر (منصوب) دەكەن بە مەرجێك نەفی يا پرسياركردن (إستفهام) يا نەهی بكەوێتە پێشيانەوە ، ئەم بەشەش ئەمانەن : ١- زال ٢- انفك ٣- فتيء ٤- برِحَ.**

**بەشی سێ يەم: ئەم كارە دەكات بەبێ مەرج كە هەشت فيعلن كە جگە لەم دوو بەشەی سەرەوەن .**

## وتنقسم هذه الأفعال من جهة التصرف إلى ثلاثة أقسام :

القسم الأول: ما يتصرف في الفعلية تصرفاً كاملاً، بمعنى أنه يأتي منه الماضي والمضارع والأمر، وهو سبعة أفعال، وهي: (كَانَ)، و(أَمسَى)، و(أَصبَحَ)، و(أَضحىَ)، و(ظَلَ)، و(باتَ)، و(صَارَ).

القسم الثاني: ما يتصرف في الفعلية تصرفاً ناقصاً، بمعنى أنه ياتي منه الماضي والمضارع ليس غير، وهو أربعة أفعال، وهي: ١ (فَتيء)، و٢ (انْفَكَ)، و٣ - (بَرِحَ)، و٤ (زَالَ).

القسم الثالث: ما لا يتصرف أصلاً، وهو فعلان: أحدهما " ليس " اتفاقاً والثاني (دامَ) على الأصح .

وغير الماضي من هذه الأفعال يعمل عمل الماضي، نحو قوله تعالى:

﴿ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴾ ﴿ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ ﴾ ﴿ تَاللَّهِ تَفْتَؤُاْ تَذْكُرُ يُوسُفَ ﴾

**وه ئه فيعلانەش لەرووى گۆڕان دابەش دەبن بۆ سێ بەش:**

**بەشى يەكەم: بەتەواوى دەگۆڕێ ، واتە: رابردوو (ماضي) و رانەبردوو (مضارع) و ئەمرى لێ دێت ، ئەوانەش حەوت فيعلن كە ئەمانەن (كان– امسى – اصبح– اضحى – ظلَّ– باتَ– صار)**

**بەشى دووەم: بەتەواوى ناگۆڕێ ، واتە تەنها (ماض) و (مضارع) ى لێ دێت، ئەوانەش چوار فيعلن كە ئەمانەن (فتيء– انفك – بَرح – زال).**

**بەشى سێ يەم: ئەو فيعلانەن كە ناگۆڕێن ، كە دوو فيعلن يەكێكيان (ليس) يە ، بە كۆدەنگى زانايانى (نحو) دووەميان (دام) يە لە قسەى**

راستر.

* وه غەیری (ماضي) لەم فیعلانه وەکو (ماضي) کار دەکەن وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴾[1] ﴿ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ ﴾[2] ﴿ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُاْ تَذْكُرُ يُوسُفَ ﴾[3] لێرەدا تەقدیر دەکرێ (تالله لا تفتا تذكر يوسف)

---

(1) (هود-١١٨) (ولا) الواو: حرف عطف (لا) حرف نفي (يزالون) فعل مضارع ناسخ مرفوع بثبوت النون ، واو الجماعة : ضمير مبني على السكون في محل رفع اسم يزال (مختلفين) خبر يزال منصوب بالياء.

(2) (طه-٩١) (لن) حرف نفي ونصب (نبرحَ) فعل مضارع ناسخ منصوب بالفتحة، اسم (نبرح) ضمير مستتر تقديره (نحن) (عليه) جار ومجرور (عاكفين) خبر نبرح منصوب بالياء.

(3) (يوسف-٨٥) (تالله) التاء: حرف قسم وجر، لفظ الجلالة اسم مجرور بالكسرة (تَفْتَأ) فعل مضارع ناقص مرفوع بالضمة ، اسم (تفتأ) ضمير مستتر تقديره أنت(تذكر) فعل مضارع مرفوع بالضمة ، والفاعل ضمير مستتر تقديره أنت، والجملة في محل رفع خبر (تفتأ) (يوسف) مفعول به منصوب بالفتحة.

## إنَّ وَأخواتها / (إنَّ) و خوشكەكانی ، یا هاوێنەكانی

قال: وأما ("إن" وأخواتها) فإنَها تَنصِبُ الاسم وترفع الخَبَرَ، وَهيَ: (إنَّ)، و(أَنَّ)، و(لَكِنَّ)، و(كأنَّ)، و(ليتَ)، و(لَعَلَّ)، تقُولُ: (إنَّ زيداً قائمٌ)، وَ(ليَتَ عمراً شاخصٌ)، وما أشبه ذلك، ومعنى (إنَّ)، وَ(أَنَّ) التَوكِيدُ، و(لَكِنَّ) لِلاستدْرَاك، و(كأن) للتشبيه، و(ليت) للتمني، و(لعل) للترجي والتَوَقُّعِ.

وأقول: القسم الثاني من نواسخ المبتدا والخبر " إن " وأخواتها، أي: نظائرها في العمل، وهي تدخل على المبتدأ والخبر، فتنصب المبتدأ ويسمى اسمها، وترفع الخبر بمعنى أنها تجدد له رفعاً غير الذي كان له قبل دخولها، ويسمى خبرها، وهذه الأدوات كلها حروف، وهي ستة:

**دانەر دەڵێ : (إنَّ) و هاوێنەكانی ناو (منصوب) دەكەن وە خەبەر مەرفوع دەكەن، كە ئەمانەن (إنَّ- أنَّ- لكنَّ- كأنَّ- ليتَ- لعلَّ) دەڵێ ی (إنَّ زيداً قائمُ)، وَ(ليَتَ عمراً شاخصٌ) وە وێنەی ئەمانە ، مانای (إنَّ) وە (أنَّ) لەبۆ تەئكیدە[1] وە (لكنَّ) بۆ زانین و تێگەیشتنە ، وە (كأنَّ) بۆ پێ چواندنە وە (ليت) بۆ خۆزگەیە وە (لعلَّ) بۆ تكاوابوون و لاوا بوونە.**

**وە دەڵێم: بەشی دووەم لە لابەرەكانی (مبتدا) وە خەبەر (إنَّ) و خوشكەكانیەتی واتە هاوشێوەكانیەتی لە كاركردندا، ئەمانە دەچنە**

---

**(1) (تأكيد) وە (توكيد) جیاوازیان نیە) ، (إنَّ- أنَّ) خەبەرو هەواڵی (مبتدا) بە هێزدەكات لە زمانی كوردی لە واتای (إنَّ- أنَّ) بێ گومان یان بە ڕاستی دەوترێ كە دەڵێ ی (إنَّ زيداً قائمٌ) واتە: بێ گومان زەید وەستاوە ، (إنَّ) حرف توكيد ونصب (زيداً) اسم إنَّ منصوب بالفتحة (قائم) خبر إنَّ مرفوع بالضمة.**

سەر (مبتدا) و خەبەر یەکەم (منصوب) دەکەن ناو دەنرێ بە (إسم)ی ئەو ، وە خەبەریش مەرفوع دەکەن واتە رەفعێکی نوێی بۆ درووست دەکەن جگە لەو رەفعەی کە پێشتر بوویەتی وە ناو دەنرێ بە خەبەری ئەو ، وە ئەم ئەداتانەش هەموویان حەرفن کە شەشن:

الأول: " إنَّ " بكسر الهمزة . والثاني: " أنَّ " بفتح الهمزة.

وهما يدلان على التوكيد، ومعناه تقوية نسبة الخبر للمبتدأ، نحو (إن أباك حاضر) ، ونحو (عَلِمْتُ أنَّ أبَاكَ مُسافرٌ).

والثالث: " لكن " ومعناه الاستدراك، وهو تعقيب[١] الكلام بنفي ما يتوهم[٢] ثبوته أو إثبات ما يتوهم نفيه، نحو (محمد شجاع لكنَّ صدِيقهُ جَبان).

یەکەم : (إنَّ) بە کەسرە لەژێر هەمزەکە ، دووەم : (أَنَّ) بە فەتحە لەسەر هەمزەکەی ، ئەم دووە هەردووکیان مانای تەئکید دەدەنەوە ، یانی بەهێز کردنی خەبەر بۆ (مبتدا) وەك (إنَّ اباك حاضر) واتە: بێ گومان باوکت ئامادەیە، وە وەك (علمتُ انَّ أَباك مسافرٌ)

{علمت: فعل وفاعل (أَنَّ) حرف توكيد ونصب (اباك) اسم إنَّ منصوب بالألف لأنه من الأسماء الخمسة وهو مضاف (الكاف) مضاف إليه ، (مسافر) خبر ان مرفوع بالضمة}.

سێ یەم: (لكنَّ) واتە: زانین و پێ گەیشتن ، کە بریتیە لە تێبینی کردنی قسە بەنەفی کردنی شتێك کە وا بەخەیاڵدا بێت ئەم شتە هەبێت

---

(1) تعقيب: تعليق ، تقديم ملاحظة / بەدوادا ووتن ، روونکردنەوە ، تێبینی کردن.

(2) توهم: تصور – تخيل / وابەبیردا هاتن ، وا بەخەیاڵدا هاتن.

**، یا جێگیر کردنی شتێك کەوا بە بیرت دابێت نەبێت وەك (محمد شجاع لكنَّ صديقَه جبان) ، محمد شجاع : مبتدا وخبر (لكنَّ) حرف استدراك ونصب (صديقَه) اسم لكن، الهاء: مضاف إليه (جبان) خبر لكنَّ مرفوع بالضمة.**

والرابع: " كأن " وهو يدل على تشبيه المبتدأ بالخبر، نحو: (كأنَّ الجارِيةَ بَدْرٌ).

والخامس: " ليت " ومعناه التمني، وهو: طلب المستحيل أو ما فيه عسر، (لَيت الشَّبَابَ عَائِدٌ)، و نحو (لَيْتَ الْبَلِيدَ يَنْجَحُ).

والسادس: " لعل " وهو يدل على الترجي أو التوقع، ومعنى الترجي: طلب الأمرالمحبوب، ولا يكون إلا في الممكن نحو: (لَعَلَّ اللهَ يَرْحَمُني)، ومعنى التوقع: انتظار وقوع الأمر المكروه في ذاته، نحو (لَعلَّ العَدُوَ قَرِيبٌ مِنَّا) .

**چوارەم: (كأنَّ) ئەوە ئاماژەیە بۆ پێچواندنی (مبتدا) بە خەبەر وەك (كأنَّ الجارية[1] بدرٌ) واتە : کچەکە دەڵێ ی مانگی چواردەیە.**

**{كأنَّ: حرف تشبيه ونصب (الجارية) اسم كأنَّ منصوب بالفتحة (بدر) خبر كأنَّ مرفوع بالضمة}.**

**پێنجەم: (ليتَ) واتە: خۆزگە ، ئەمە مانای داواکردنی شتێکە کە نەگونجێ ببێ ، یا بونی زەحمەت بێت وەك (ليت الشباب عائدٌ) (ليتَ البليد[2] ينجح) (کە یەکەمیان ناگونجێ ببێ گەڕانەوەی گەنجایەتی ، دووەمیان زەحمەتە کە ئینسانی گێل ناجح ببێت، {(ليت) حرف تمن و نصب (البليد) اسم ليت منصوب بالفتحة (ينجح) فعل مضارع مرفوع**

---

(1) الجارية: کچی گەنج ، ئافرەتی کۆیلە ، ئافرەتی زەنجی واتە پێست ڕەش .

(2) البليد: غبي ، احمق ، گەوج – گێل.

بالضمة والفاعل ضمير مستتر تقديره هو والجملة ينجح في محل رفع خبر ليت}.

شەشەم: (لعلَّ) ماناى تكابوون يا لاوابوونە، ماناى (ترجي) داواى كارێكى خۆشەويست كردنە ، ئەمەش تەنها بۆ شتێك دەبێت كە بگونجێ بكرێ وەك (لعلَّ الله يرحمُني)

وە ماناى (توقع) چاوەڕوانى شتێكى ناخۆش بێت كە رووبدات وەك (لعل العدوَّ قريبٌ منا) واتە لام وايە دوژمن لە ئێمەوە نزيك بێت (لعل) حرف توقع ونصب (العدوَّ) اسم لعل منصوب بالفتحة (قريب) خبر لعل مرفوع بالضمة (منا) جار ومجرور.

# ظن وأخواتها / (ظنَّ) و هاو وێنەکانی

قال: وأما (ظَننتُ وَأَخَواتُها) فإنها تنصب المبتدأ والخبر على انهما مفعولان لها، وهي: (ظَننتُ)، وَ(حَسِبتُ)، و(خِلتُ، و(زَعَمتُ)، وَ(رَأَيتُ)، وَ(عَلِمتُ)، وَ(وَجَدتُ)، وَ(اِتَخَذتُ)، وَ(جَعَلتُ)،وَ(سَمِعتُ)، تقولُ: (ظننتُ زيداً قائماً)، وَ(رَأيتُ عُمَراً شاخِصاً)، وَمَا أَشبهَ ذلك.

وأقول: القسم الثالث من نواسخ المبتدأ والخبر، (ظننتُ) وأخواتُها) أي: نظائرها في العمل، وهي تدخل على المبتدأ والخبر فتنصبهما جميعاً، ويقال للمبتدأ مفعول أول وللخبر (مفعول ثانٍ)، وهذا القسم عشرة أفعال:

**دانەر دەڵێ (ظننت) و هاو وێنەکانی (مبتدا) و خەبەر (منصوب) دەکەن هەردووکیان دەبنە (مفعول)ی ئەو ، کە ئەمانەن (ظننت – حسبت– خلت– زعمتُ– رایت– علمت– وجدت – اتخذت– جعلت– سمعت).**

**دەڵێ ی (ظننت زیداً قائماً) (رایت عَمْراً شاخصاً) وە ئەمانەش کە لەمانە دەچن.**

**{رایتُ: فعل وفاعل (عمْراً) مفعول اوَّل لـ(رای) منصوب بالفتحة (شاخصاً) مفعول ثانٍ لـ(رای) منصوب بالفتحة}.**

**وە دەڵێم: بەشی سێ یەم لە لابەرەکانی یاسای (مبتدا) و خەبەر (ظننتُ) و هاوتاکانیەتی لە کارکردندا، ئەوانە دەچنە سەر (مبتدا) و خەبەر هەردووکیان (منصوب) دەکەن دەگوترێتە (مبتدا) (مفعول اوَّل) وە خەبەرەکەش (مفعول ثانٍ) وە ئەو بەشەش دە فیعلن:**

الأول: " ظننت " نحو (ظَنَنتُ محمداً صَديقاً).

الثاني: " حسبت " نحو (حَسِبتُ المالَ نَافِعاً).

الثالث: " خِلت " نحو (خِلْتُ الحَدِيقَةَ مُثْمِرَةً).

الرابع: " زعمت " نحو (زَعَمْتُ بَكراً جَرِيئاً).

الخامس: " رايت " نحو (رَأَيتُ إِبْرَاهِيمَ مُفْلِحاً).

السادس: " علمت " نحو (عَلِمْتُ الصِّدْقَ مُنْجِياً).

السابع: " وجدت " نحو (وَجَدْتُ الصَّلاحَ بَابَ الخَيْرِ).

الثامن: " اتخذت " نحو (اِتَخَذت مُحَمَّداً صَدِيقاً).

التاسع: " جعلت " نحو (جَعَلتُ الذَّهبَ خاتِماً).

العاشر: " سمعت " نحو (سَمِعْتُ خليلاً يقْرَأ).

**{ئەمانە زیاتریان نموونەن بۆیە وەرنەگێڕاون بۆ (إعراب) یان ووشەی یەکەمیان فعل (ماضي) و فاعیلن ووشەی دووەم و سێیەمیان مفعولی یەکەم و دووەمن ، بۆ نموونە دەڵێ ی (ظننتُ) فعل ماضي مبني على السكون ، والتاء: ضمير متصل مبني على الضم في محل رفع فاعل ، (محمداً) مفعول اول لـ(ظنَّ) منصوب بالفتحة (صديقاً) مفعول ثانٍ لـ(ظن) منصوب بالفتحة}.**

## وهذه الافعال العشرة تنقسم إلى أر بعة أقسام:

القسم الأول: يفيد ترجيح وقوع الخبر. وهو أربعة أفعال: (ظننت)، و(حسبت)، و(خلت)، و(زعمت) .

والقسم الثاني: يفيد اليقين وتحقيق وقوع الخبر، وهو ثلاثة أفعال، وهي: (رأيتُ)، و(علمت)، و(وجدت) .

والقسم الثالث: يفيد التصيير والانتقال، وهو فعلان، (اِتَخَذْتُ)، و(جَعَلْتُ) .

والقسم الرابع: يفيد النسبة في السمع، وهو فعل واحد، وهو (سمعت) .

## وە ئەم دە فیعلەش دابەش دەبن بۆ چوار بەش :

**بەشی یەکەم: ئەم فیعلانەن مانای زیاتری روودانی خەبەرەکە دەدەن کە ئەمانەش چوار فیعلن (ظننتُ – حسبتُ– خلتُ– زعمت).**

**(بۆ نموونە کە دەڵێی : (ظننتُ زیداً قائماً) گومانم برد زەید وەستابێت ، گومانی زیاترت بەلای ئەوەدایە کە وەستا بێت).**

**{ مانای (ظن – شك – يقين**

**١- ظن : بوونی شتێکت بەسەر نەبوونی دا زاڵ کردبێت یا بە پێچەوانەوە.**

**٢- شك: هەردوو لات پێ وەك یەك بێت.**

**٣- يقين: بوون یان نەبوونی شتێکت بەتەواوی و دڵنیاییەوە بە لایەکیان دا ساغ کردبێتەوە}**

**بەشی دووەم: مانای دڵنیابوون و جێبەجێ کردنی روودانی**

**خەبەرەکەیە کە ئەمانەش سێ فیعل دەگرنە خۆ (رأیت- علمت- وجدت).**

**بەشی سێیەم: مانای گۆڕان و گوازرانەوە دەدا، کە ئەمانەش دوو فیعلن (اتخذت – جعلت).**

**بەشی چوارەم: مانای پاڵدانە بیستن دەداتەوە، کە ئەمانەش یەك فیعلە (سمعت).**

## تدريب على الإعراب

إعرب الجمل الآتية: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً ﴾ ، كأنَّ القمر مِصْباحٌ، حسِبْتُ المالَ نافعاً، مازال الكتاب رفيقي .

## الجواب

١ . (إنَّ) : حرف توكيد ونصب ينصب الاسم ويرفع الخبر، و(إبراهِيمَ) : اسم " إن " منصوب به، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، (كَان) : فعل ماض ناقص، يرفع الاسم وينصب الخبر، واسمه ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره هو يعود على إبراهيم، (أُمَّةً): خبر كان منصوب به، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، والجملة من (كان واسمه وخبره) في محل رفع خبر " إنَّ " .

٢. (كأنَّ): حرف تشبيه ونصب، ينصب الاسم ويرفع الخبر، و(القمرَ): اسم كان منصوب به وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، و(مصباحٌ): خبر كأن مرفوع به، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة.

٣ . (حسب): فعل ماض مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهوره اشتغال المحل بالسكون العارض لدفع كراهة توالي أربع متحركات فيما هو كالكلمة الواحدة، و(التاء) ضمير المتكلم فاعل حسب، مبني على الضم في محل رفع،

(المالَ): مفعول أول لحسب منصوب به، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، و(نافعاً): مفعول ثان لحسب منصوب به، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة.

٤. (ما): حرف نفي مبني على السكون، لا محل له من الإعراب، و(زال): فعل ماض ناقص يرفع الاسم وينصب الخبر، (الكتابُ): اسم (زال) مرفوع به، وعلامة رفعه ضمة ظاهرة في آخره، (رفيق): خبر زال منصوب به، وعلامة نصبه فتحة مقدرة على آخره منع من ظهورها اشتغال المحل بحركة المناسبة لياء المتكلم، ورفيق مضاف وياء المتكلم مضاف إليه مبني على السكون في محل خفض .

# باب النعت / باسی سفەت (صفة)

قال: النعت: تابع للمنعوت في رفعه ونصبه وخفضه، وتعريفه وتنكيره؛ قام زيدٌ العاقلُ، ورأيتُ زيداً العاقل، ومررت بزيد العاقل.

## النعت

وأقول: النعت في اللغة هو الوَصْفُ.

وفي اصطلاح النحويين هو: التابع المشتق أو المؤوَّلُ بالمشتق، الموضِّح لمتبوعه في المعارف، المخصِّصُ له في النكرات.

**دانەر دەڵێ (صفة)[1] شوێنی وەسفکراو (موصوف) دەکەوێ لە رەفع و (نصب) و جەڕ ، وە لە دیاری لە نادیاری، دەڵێ ی (قام زيد العاقلُ) (رايت زيداً العاقلَ) (مررتُ بزيد العاقلِ) {(قام) فعل ماض (زيد) فاعل (العاقلُ) نعت مرفوع بالضمة ، کەواتە (زيد) لێرەدا پێی دەوترێ (متبوع – موصوف– منعوت)}.**

**وە لە زارەوەدا بریتیە : لە شوێنکەوتەیەکی (مشتق)[2] یا لێکدراوە بە**

---

**(1) (صفة) لەگەڵ (نعت) یەکن : واتە: وەسف کردن (منعوت) لەگەڵ (موصوف) یەکن واتە: ئەوەی کە وەسفی کراوە.**

**(2) (مشتق) ئەوەیە کە لە سەروچاوە (مصدر) وەربگیرێ ، (مشتق) ئەمانە دەگرێتە خۆ (فعل ماضي– مضارع– امر– اسم فاعل – اسم مفعول– صفة المشبه – اسم تفضيل– اسم زمان– اسم مكان – اسم الآلة–)**

(مشتق)[1] ئەگەر شوێن کەوتەکە (متبوع) دیارو ناسراو بوو ئەوە نەعتەکە روونی دەکاتەوە ، وە ئەگەر شوێن کەوتەکە نەناسراو (نکرە) بوو تایبەت مەندی دەکات (بەڵام هەر ناشبێتە) (معرفە) وەك : (قام زید العاقلُ) (رایتُ زیداً العاقلَ) مررتُ بزیدِ العاقلِ) (لێرە کە تاماشای دەکەی دەبینی (زید) لە نموونەی یەکەم فاعل و مەرفوعە (العاقل) کە نەعتی ئەوە ئەویش مەرفوع وە هەروەها (معرفە) شە ، (اَل) ی لەسەرە ، لە ئی دووەم زید (مفعول به) یە (منصوب)ە، نەعتەکەشی (منصوب)ە وە هەروەها ...)

## والنعتُ ينقسمُ إلى قسمين:

الأولُ: النعتُ الحقيقي، والثاني: النعت السببي.

أما النعتُ الحقيقي.. فهو: ما رفع ضميراً مستتراً يعود إلى المنعوت، نحو (جاءَ مُحَمدٌ اَلْعَاقِلُ) فالعاقل: نعتٌ لـ(محمد)، وهو رافع لضمير مستتر تقديره هو يعود إلى (محمد).

وأما النعت السَبَبيُ فَهُو: ما رفع اسماً ظاهراً متصلاً بضمير يعود إلى المنعوت نحو (جَاءَ مُحَمَّدٌ الفَاضِلُ أَبُوه) فالفاضلُ: نعت لـ(محمد)، و(أبوه): فاعل لـ(الفاضل)، مرفوع بالواو نيابة عن الضمة لأنه من الأسماء الخمسة، وهو مضاف إلى الهاء التي هي ضمير عائد إلى (محمد).

---

(1) دەڵێ ی (عندی رجلٌ اسد) (اسد) جامدە (مشتق) نی یە ، بەڵام بە (شجاع) لێکدەدرێتەوە کە (مشتق)ە.

**نەعت دابەش دەبێت بۆ دووبەش :**

**یەکەم: نەعتی حەقیقی ، دووەم: نەعتی سەبەبی.**

**نەعتی حەقیقی ئەوەیە راناوێکی شاراوە مەرفوع دەکات کە دەگەڕێتەوە بۆ وەسف کراوەکە ، وەك (جاء محمد العاقلُ) العاقل: نعت لـ(محمد) کە ئەمە واتە (العاقل) ڕاناوێکی شاراوەی تەقدیرکراوی مەرفوع کردووە کە دەگەڕێتەوە بۆ (محمد).**

**وە نەعتی سەبەبی ئەوەیە ناوێکی ئاشکرای مەرفوع کردووە کە راناوێکی پێوە لکاوە دەگەڕێتەوە بۆ وەسف کراوەکە ، وەك (جاء محمد الفاضلُ ابوهُ) (الفاضل)[1] نعت لـ(محمد) وە (ابوه) فاعل لـ(الفاضل) مرفوع بالواو نیابة عن الضمة لأنه من الأسماء الخمسة ، وهو مضاف ، بۆ ئەو (هاء)ەی کە راناوێکە دەگەڕێتەوە بۆ محمد.**

وحكم النعت أنه يتبع منعوته في إعرابه، وفي تعريفه أو تنكيره، سواءٌ أكان حقيقياً أم سببياً.

ومعنى هذا أنه إن كان المنعوت مرفوعاً كان النعت مرفوعاً، نحو: (حَضَرَ مُحَمَّدُ الفَاضِلُ) أو (حَضَرَ مُحَمَّدٌ الفَاضِلُ أَبُوه)، وإن كان المنعوت منصوباً كان النعت منصوباً نحو: (رَأَيْتُ مُحَمَّداً الفَاضِلَ) أو (رَأَيْتُ مُحَمَّداً الفَاضِلُ أَبُوهُ)، وإن كان المنعوت مخفوضاً كان النعت مخفوضاً نحو: (نَظَرْتُ إِلى مُحَمَّدٍ الْفَاضِلِ) أو (نَظَرْتُ إِلى مُحَمَّدٍ الفَاضِلِ أَبُوهُ)، وإن كان المنعوت معرفة كان النعت معرفة، كما في جميع الأمثلة السابقة. وإن كان المنعوت نكرة كان النعتُ نكرة، (رَأيتُ رَجُلاً عاقلاً) أو (رَأَيْتُ رَجُلاً عَاقِلاً أَبُوهُ).

---

**(1) الفاضل: واتە: ذو الفضل، یانی خاوەنی چاکەو پیاوەتی.**

**وه ياساى نەعت شوێنى وەسف كراوەكەى دەكەوێ لە (إعراب) دا وە لە ناسراوى و نەناسراوى جا نەعتەكە حەقيقى بێت يا سەبەبى .**

**ماناى ئەوە كە وەسف كراو مەرفوع بوو ئەوە نەعتيش مەرفوع دەبێت، وەك: (حَضر محمد الفاضل) يا (حضر محمد الفاضلُ ابوه) ئەگەر وەسف كراو (منصوب) بوو ، ئەوە نەعتيش (منصوب) دەبێت وەك (رايت محمداً الفاضِلَ) يا (رايت محمداً الفاضِلَ ابوهُ) وە ئەگەر وەسف كراو مەجرور بوو ئەوە نەعتيش مەجرور دەبێت وەك (نظرت إلى محمد الفاضل) يا (نظرت إلى محمد الفاضلِ ابوه) وە ئەگەر وەسف كراو ناسراو بوو ئەوە نەعتيش ناسراو دەبێت هەروەكو لەهەموو ئەو نموونانەى رابرد وابوو، وەئەگەر وەسف كراو نەناسراو بوو ئەوە نەعتيش نەناسراو دەبێت وەك (رايت رجلاً عاقلاً) يا (رايت رجلاً عاقلاً ابوهُ)[1].**

ثم إن كان النعت حقيقياً زاد على ذلك أنه يتبع منعوته في تذكيره أو تأنيثه، وفي إفراده أو تثنيته أو جمعه.

ومعنى ذلك أنه إن كان المنعوت مذكراً كان النعتُ مذكراً، نحو: (رأيتُ مُحمداً العاقِلَ) و إن كان المنعوتُ مؤنثاً كان النعتُ مؤنثاً نحو: (رأيتُ فاطِمةَ المهذَّبةَ)وإن كان المنعوت مفرداً كان النعتُ مفرداً كما رأيت في هذين المثالين، وإن كان

---

**(1) رايت: فعل وفاعل (رجلاً) مفعول به (عاقلاً) نعت منصوب بالفتحة (ابوه) فاعل مرفوع بالواو وهو مضاف (الهاء) ضمير مبني على الضم يف محل جر مضاف إليه ، لێرەدا (رجلاً) ناوێكى نەناسراوە كە وەسف كراوەكەيە (عاقلاً) ئەمەش نەعتێكى نەناسراوە وە بزانە هەر ناوێك كە تەنوينى لە كۆتاييەكەيدا هەبوو ئەوە ناوێكى نەناسراوە.**

المنعوت مثنى كان النعت مثنى، نحو: (رأيتُ المحمدَيْن العَاقِلِين)» وإن كان المنعوت جمعاً كان النعتُ جمعاً نحو: « رأيتُ الرجالَ العُقَلاءَ».

**له پاشان ئەگەر نەعتەکە حەقیقی بوو ... جگە لەوەش کە باسکرا ئەوەیە شوێنی وەسفکراوەکەی دەکەوێ لە نێراتی یا مێیاتی وە لە تاکی یا جووتی یا لە کۆو جەمعدا.**

**مانای ئەمانە : ئەگەر وەسف کراو نێر بوو ئەوە نەعتیش نێر دەبێت وەك (رأيت محمداً العاقلَ) وەئەگەر وەسف کراو مێ بوو ئەوە نەعتیش مێ دەبێت وەك (رأيت فاطمةَ المهذَّبَةَ)[1] وە ئەگەر وەسف کراو تاك بوو ئەوە نەعتەکەش تاك دەبێت هەروەکو لەم دوو نموونەی باسکرا، وە ئەگەر وەسفکراو جووت بوو ئەو کاتە نەعتەکەش جووت دەبێت وەك (رايتُ المحمدين العاقلين)[2] وە ئەگەر وەسف کراوەکە کۆ بوو ئەوە نەعتەکەش کۆ دەبێت وەك (رايت الرجالَ العقلاءَ) الرجالَ: مفعول به منصوب بالفتحة (العقلاء) نعت منصوب بالفتحة.**

أما النعتُ السببي فإنه يكون مفرداً دائماً ولو كان منعوته مثنى أو مجموعاً تقول: (رأيتُ الوَلَدَينِ العَاقِلَ أبوهما) وتقول: (رأيتُ الأَولادَ العاقِلَ أَبوهم).

ويتبع النعت السببي ما بعده في التذكير أو التأنيث، تقول: (رأيتُ البنات العاقلَ أبوهُنَّ)، وتقول: (رأيتُ الأَوْلادَ العاقِلَةَ أُمُّهُمْ).

فتلخص من هذا الإيضاح أن النعت الحقيقي يتبع منعوته في أربعة من عشرة.

---

**(1) واته: فاتیمەی رەوشت پاکم بینی ، (التَهذيب) واته (التَّنقيه) یانی پاك کردنەوە، رايتُ: فعل ماضي و فاعل (فاطمة) مفعول به (المهذبةَ) نعت منصوب بالفتحة.**

**(2) رايتُ: فعل و فاعل (المحمدين) مفعول به منصوب بالياء لأنه مثنى (العاقلين) نعت منصوب بالياء لأنه مثنى.**

واحد من الإفراد والتثنية والجمع، وواحد من الرفع والنصب والخفض، وواحد من التذكير والتأنيث، وواحد من التعريف والتنكير.

والنعت السببي يتبع منعوته في اثنين من خمسة:

واحد من الرفع والنصب والخفض، وواحد من التعريف والتنكير، ويتبع مرفوعه الذي بعده في واحد من اثنين وهما التذكير والتأنيث.

ولا يتبع شيئاً في الإفراد والتثنية والجمع، بل يكون مفرداً دائماً وأبداً، والله أعلم.

**بەلاّم نەعتی سەبەبی بەردەوام تاك دەبێت هەرچەندە ئەگەر وەسفكراوەكەشی جووت بوو یا كۆ بوو دەڵێ ی (رایت الوَلدین العاقل ابوهما) وە (رایت الأولادَ العاقِلَ ابوهم).**

**وە نەعتی سەبەبی شوێنی ئەوەی دوای خۆی دەكەوێ لە نێرایەتی یا مێیایەتی دەڵێ ی ( رایت البنات العاقلَ ابوهن) وە دەڵێی (رایت الأولاد العاقلة اُمّهم)**

**لەم روونكردنەوەیە بە كورتی : نەعتی حەقیقی شوێنی وەسفكراوەكەی دەكەوێ لە چوار خاڵ كە (١٠) شت دەگرنە خۆ یەك : لە تاكی و جووتی و كۆدا ، وە یەك: لە رەفع و (نصب) و جەڕدا ، وە یەك : لە نێرو مێیاتیدا ، وە یەكیش لە ناسراوی و نەناسراوی دا.**

**وە نەعتی سەبەبی شوێنی وەسفكراوەكەی دەكەوێ لە دوو خاڵ كە پێنج شت دەگرێتە خۆ یەك: لە رەفع و نەصب و جەڕ ، وە یەكیش لە ناسراوی و نەناسراوی ، وە شوێنی ئەو مەرفوعە دەكەوێ كە لەدوای دێت لە یەك خاڵ كە ئەم خاڵە دوو شت دەگرێتە خۆ كە نێرایەتی و مێیایەتیە. وە شوێنی تاكی و جووتی و كۆ ناكەوێت ، بەڵكو بەردەوام تاكە ، وە خواش زاناترە.**

## المعرفة وأقسامها / ناوی ناسراوو بەشەکانی

قال: والمعرفة خمسة أشياء: ١ - الاسمُ المُضْمَرُ نحو: (أَنا) وَ(أَنْتَ)، و٢ - الاسمُ الْعَلَمُ نحو: (زَيْدٌ) وَ(مَكَّةُ)، و٣ -الاسمُ الْمُبهَمُ[١] نحو: (هذا) و(هذهِ) و(هؤلاءِ) و٤ -الاسم الذي فيه الالف واللام نحو:(الرَّجلُ) و(الْغُلامُ)، و٥ -ما أضيف إلى واحدٍ من هذه الأربعة.

وأقولُ: اعلم أن الاسم ينقسم إلى قسمين الأول: النكرة. وستأتي. والثاني: المعرفة وهي: اللفظ الذي يدل على معَيَنٍ[٢]، وأقسامها خمسة:

**دانەر دەڵێ: ناوی ناسراو پێنج شتە ١- ناوی شاراوە (واتە راناو (ضمیر) وەك (انا – انت) وە ناوی دیار وەك (زید – مكة) ٣- (اسم اشارة) و (اسم موصول)وەك (هذا – هذه –هؤلاء) ٤- ئەو ناوەی كە (ال) ناساندنی لەسەرەتاوە هەیە وەك (الرجل- الغلام) ٥- وە ئەو ناوەش كە پاڵدراوەتە (إضافة) كراوە بۆ یەكێك لەم چوارەی باسكرا.**

**وە دەڵێم: بزانە ناو دابەش دەبێت بۆ دوو بەش یەكەم: نەناسراو كە لەبابەتی دوای ئەمە باسی دەكرێ ، دووەم: ناسراو، كە بریتیە لەو ناوەی كە ئاماژە بۆ شتێكی دیاری كراو دەكات ، كە پێنج بەشن.**

**كە ئەمانەن (هو) بۆ غایبی نێری تاكە (هی) بۆ ئامادە نەبووی مێ ی**

---

**(1) مبهم: لە زمانەوانیدا واتە : غامض ، نادیار ، بۆیە وا ناونراوە چونكە ئەمانە لە خودی خۆیان بەتەنها مانایان نازانرێ ، بەڵكو بەهۆی ئاماژەو (صلة) مانایان دەزانرێ، (صلة) هەر لە درێژەی ئەم بابەتە باسی دەكرێ كە چی یە .**

**(2) معین: مُحدَّد- مخصص، دیاری كراو ، تایبەت كراو.**

**تاکە (هما) بۆ جووتی غائبە جا نێر بێت یا مێ (هم) بۆ کۆمەڵە نێرێکی غایبە ، (هُنّ) بۆ کۆمەڵە مێ یەکی ئامادە نەبووە.**

**وە ئەم روون کردنەوەیەش لە باسی لێکۆڵینەوە دەربارەی فاعل و (مبتدا) و خەبەر باسکراوە.**

**القسم الأول**: المضمر أو الضمير، وهو ما دل على متكلم، نحو: (أنا)، أو مخاطب نحو: (أنت)، أو غائب نحو: (هو)، ومن هنا تعلم أن الضمير ثلاثة أنواع.

النوع الأول: ما وضع للدلالة[1] على المتكلم وهو كلمتان، وهما: « أنا » للمتكلم وحده، و « نحن » للمتكلم المعظِّم نَفسَهُ أو معه غيره.

والنوع الثاني: ما وضع للدلالة على المخاطب وهو خمسة ألفاظ، وهي: (أنتَ) بفتح التاء للمخاطب المذكر المفرد، و(أنتِ) بكسر التاء للمخاطبة المؤنثة المفردة و (أنتما) للمخاطب المثنى مذكراً كان أو مؤنثاً و (أنتُم) لجمع الذكور المخاطبين، و (أنتُنَّ) لجمع الإناث المخاطبات.

والنوع الثالث: ما وضع للدلالة على الغائب، وهو خمسة ألفاظ أيضاً، وهي: (هُو) للغائب المذكر المفرد. و(هِيَ) للغائبة المؤنثة المفردة، و (هُمَا) للمثنى الغائبُ مطلقاً، مذكراً كان أو مؤنثاً، و(هُم) لجمع الذكور الغائبين، و(هُنَّ) لجمع الإناث الغائبات.

وتقدم هذا البيانُ في (بحث[2] الفاعل)، وفي (بحث المبتدأ والخبر).

**بەشی یەکەم : شاراوە یا راناو (ضمیر) ئەمە بریتیە لەوەی ئاماژە بێت**

---

**(1) دَلالةَ: إشارة ، علامة، برهان، إرشاد، یانی : ئامارژە ، نیشانە ، بەڵگە ، رێنمایی.**
**(2) بحث: لێکۆڵینەوە.**

بۆ قسەکەر وەك (انا) یا قسە لەگەڵکراو وەك (انت) یا ئامادە نەبوو غایب وەك (هو) لێرەدا دەزانی کە (ضمیر) سێ جۆرە .

**جۆری یەکەم :** ئەوەی کە دانراوە بۆ ئەوەی ئاماژە بێت بۆ قسەکەر کە ئەمەش دوو ووشەن (انا) بۆ یەك قسەکەر (نحن) بۆ یەکێك کە خۆی گەورە بکا ، یا کەسی تریشی لەگەڵدا بێت.

**جۆری دووەم :** ئەوەی کە دانراوە بۆ ئەوەی نیشانە بێت بۆ قسە لەگەڵ کراو کە ئەمەش پێنج ووشەن (انتَ) بۆ قسەلەگەڵ کراوی تاکی نێر (انتِ) بۆ قسە لەگەڵ کراوی تاکی مێ (انتما) بۆ دوو کەسی قسە لەگەڵ کراودا جا نێر بن یا مێ (انتم) بۆ کۆمەڵێ قسە لەگەڵ کراوی نێردا (انتنَّ) بۆ کۆمەڵێ مێ ی قسە لەگەڵ کراودا .

**جۆری سێ یەم:** ئەوەی کە دانراوە کە ئاماژە بێت بۆ غایب، کە ئەمەش پێنج ووشەن:

**القسم الثاني** من المعرفة: العَلَمُ[1]، وهو ما يدلُ على معين بدون احتياج إلى قرينة[2] تكلُّم أو خطاب أو غيرهما، وهو نوعان: ١ -مذكر نحو (محمد) و (إبراهيم) و (جبل) ومؤنث نحو (فاطمة) و (زينب) و (مكة) .

**بەشی دووەم لە ناسراو : ناوی دیارە ، کە ئەمە برتیە لەوەی کە**

---

(1) العَلَم: لە زمان دا واتە: العلامة، نیشانە (اسم علم) واتە : ناوی دیار .

(2) قرین: هاوڕێ – برادەر، بەستراو بە ، (قرينة الكلام) ما يصاحبه ويدلّ على المراد به ، واتە: ئەوەی هاوڕێیەتی دەکات ئاماژە بۆ مەبەست پێ ی دەکات بابەتەکانی (معرفة) کە لێرە باس کراوە هەموویان (قرينة) ن وەك (الـ) ی ناساندن (اسم إشارة)... کەواتە : ناوی (علم) لە خودی خۆیدا ناسراوە پێویستی بە هیچ شتێکی تر نی یە بۆ ئەوەی ناسراوی بکات.

**ئاماژە بۆ دیاری کراوێك دەکات بەبێ پێویست بوون بە بەستانەوەی بە قسەکردن یا وتار یا غەیری ئەم دووە کە ئەمەش دوو جۆرە : ١- نێر وەك (محمد- ابراهیم- جبل) ٢- مێ وەك (فاطمة - زینب- مكة).**

**القسم الثالث**: الاسم المبهم[١]، وهو نوعان: اسمُ الإشارة، والاسمُ الموصول.

أما اسم الإِشارة: فهو: ما وضع ليدل على معين بواسطة إشارةحسية أو معنوية[٢] وله ألفاظ معينة، وهي: (هذا) للمذكر المفرد، (وهاتَانِ) أو (هاتينِ) للمثنى المؤنث، و (هؤلاء) للجمع مطلقاً.

وأما الاسم الموصول... فهو: ما يدل على معين بواسطة جملة أو شبهها. تذكر بعده ألبته وتسمى صِلة، وتكون مشتملة على ضمير يطابق الموصول ويسمى عائداً، ولهاألفاظ معينة أيضاً، وهي: (الذي) للمفرد المذكر، (التي) للمفردة المؤنثة، و (اللَّذَانِ) أو (اللَّذَيْنِ) للمثنى المذكر، و (اللَّتانِ) أو (اللَّتَيْنِ) للمثنى المؤنث، (والَّذِين) لجمع الذكور، و (اللَّائِي) ، أو (اللاتي) لجمع الإناث.

**بەشی سێیەم: ناوی نادیار کە دوو جۆرە ١- اسمُ إشارە ٢- اسم موصول (إسم إشارە) ئەوەیە دانراوە بۆ ئاماژە کردن بۆ ناوێکی دیاری کراو، بەهۆی ئاماژە کردن بۆ شتێکی هەست پێکراو (وەکو دارو بەرد) یا بۆ شتێکی (معنوی) (واتە ماددە نەبێت وەك ژیری و تێگەیشتن "العقل – الفهم").**

**وە چەند ووشەیەکی دیاری کراویش بەکاردێت بۆ ئەم مەبەستە کە**

---

(1) مبهم: غامض، نادیار ، کەمێك بگەڕێوە دواوە بۆ زیاتر.

(2) معنوي: لامادي، شتێك کە ماددە نەبێت، وە گوتمان وەك (عقل – فهم).

ئەمانەن : (هذا) بۆ نێری تاك (هذه) بۆ مێی تاك (هذان) یا (هذین) بۆ جووتی نێر (هاتان) یا (هاتین) بۆ جووتی مێ (هؤلاء) بۆ كۆی نێرو مێ.

وە (اسم موصول) ئەوەیە ئاماژە دەكات بۆ شتێكی دیاری كراو بەهۆی رستە یا وێچوو بە رستە ، كە لەدوای خۆی باس دەكرێ و ناو دەبرێ بە (صلة) وە ئەم (صلة) یە راناو (ضمیر) ێك دەگرێتە خۆ كە وەك (موصول)ەكە وایە وە پێی دەوترێ (عائد) وە (اسم موصول) یش ووشەی تایبەتی هەن كە ئەمانەن: (الذي) كە بۆ تاكی نێرە (التي) بۆ تاكی مێیە (اللذان) یا (اللذین) بۆ جووتی نێرە (اللتان) یا (اللتین) بۆ جووتی مێیە (الذین) بۆ كۆی نێرە (اللائي) یا (اللاتي) بۆ كۆی مێ یە.

## سوود

١- غلبتُ الذي غَلَبَني

غلبتُ: فعل ماضي و فاعل (الذي) اسم موصول مبني على السكون في محل نصب مفعول به ، (غلبني) غلبَ: فعل ماضي مبني على الفتح، والفاعل ضمير مستتر تقديره هو ، والنون: للوقاية، والياء : ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب مفعول به.

جا لێرەدا (الذي) (اسم موصول) ە، (غلبني) پێ ی دەوترێ (صلة) وە فاعیلێكی (مستتر) لەناو (غلبني) دایە ئەوەیان پێ ی دەوترێ (عائد) .

٢- حضر اللذان كانا مسافرين.

(اللذان) (اسم موصول)ە فاعیلە (كانا مسافرين) پێ ی دەوترێ (صلة)، ئەلیفی (كانا) پێ ی دەوترێ (عائد) وە هەروەها ئیسمی (كان) شە (مسافرين) خبر كان منصوب بالياء لأنه مثنى.

(اللذان) اسم موصول مبني على الألف في محل رفع فاعل.

**القسم الرابع**: المحلى بالألف واللام، وهو: كل اسم اقترنت به (أَل) فأفادته التعريف، نحو (الرجل) ، و (الكتاب) ، و (الغلام)، و (الجارية).

**والقسم الخامس** : الاسم الذي أُضيف إلى واحِدٍ من الأربعة المقدَّمة فاكْتَسَب التعريف من المضاف إليه، نحو (غُلامُك) و (غلامُ مُحَمَدٍ) و (غلامُ هذا الرجُلِ) و (غلامُ الذي زارنا أمسِ) و (غُلامُ الأستاذِ).

وأعرَفُ هذه المعارف بعد لفظ الجلالة: ١- الضميرُ، ثم ٢- العَلَمُ، ثم ٣- اسم الإشارة. ثم ٤- الاسمُ الموصول، ثمَ٥- المحلى بـ(أَل)، ثمَ ٦- المضافُ إليها.

والمضاف في رتبة المضاف إليه، إلا المضاف إلى الضمير فإنه في رتبة العلم، والله أعلم.

**بەشی چوارەم : ئەو ناوانەی کە (ال) ی چوەتە سەر ، کە بریتیە لە هەموو ناوێك (ال) ی ناساندنی چوەتە سەر سەرەتاکەی کە ئەم (ال) مە مانای ناساندنی پیێ داوە وەك (الرجل- الکتاب- الغلام- الجاریة)**

**سوود:**

**هەندێ (ال) هەن لەسەرەتای ناو هاتوون مانای ناساندن نادەن چونکە ئەم (ال)ە، لە پێکهاتەی ووشەکە دان وەك (الوان – أَلسِنة)**

**بەشی پێنجەم: ئەو ناوەی دراوەتە پالْ (إضافة) کراوە بۆ یەکێك لەو چوار مەعریفانەی پێشوو ناسراوی بەدەست هێناوە لە (مضاف إلیه) وەك (غُلامك) (غلام محمد) (غلام هذا الرجل) (غلام الذي زارنا أمسِ) (غلام الأستاذ).**

**وە ناسراوترین ناسراو لە دوای ناوی (الله) ١- راناو (ضمیر)ە، ٢- ناوی دیار ، ٣- إسم إشارە ٤- إسم موصول ٥- ئەو ناوەی (ال) ی**

چووەتە سەر ٦- ئەوەی کە (إضافة) کراوە بۆ ئەو مەعریفانەی باس کرا.

وە (مضاف) لە پلەی (مضاف إليه) دایە ، تەنها (مضاف) بۆلای (ضمیر) ئەو لە پلەی (عَلَم) دایە، وە خوا زاناترە.

# النكرةُ / ناوى نەناسراو

قال: والنكرةُ: كلُّ اسم شائعٍ في جِنسِهِ لا يَختصُّ بِهِ واحِدٌ دُونَ آخَرَ، وتقريبُهُ: كُلُّ مَا صَلَحَ دخولُ الألِفِ واللامِ عليه، نَحوُ (الرجُلِ) وَ(الفَرَسِ).

وأقول: كل اسم وضع لا ليخصَّ واحداً بعينه من بين أفراد جنسه، بل ليصلح إطلاقُهُ على كل واحدٍ على سبيل البدل، نحو (رجل) و (امرأة)؛ فإن الأولى يصح إطلاقه على ذكر بالغ من بني آدم، والثاني يصح إطلاقه على كل أنثى بالغة من بني آدم.

وعلامة النكرة أن تصلح لأن تدخُلَ عليها (أل) وتؤثر فيها التعريف نحو (رجل) فإنه يصح دخول (أل) عليه، وتؤثر فيه التعريف؛ فتقول: (الرجل) وكذلك (غلام)، و(جارية)، و(صبي)، و(معلم) فإنك تقول: (الغلام)، و(الجارية)، و(الصبيّ)، و(الفتاة)، و(المعلّم).

**دانەر دەڵێ : ناوى نەناسراو هەموو ئەو ناوانەن كە بلأون لە رەگەزى خۆى ، يەكێك لە ناوەكان تايبەت ناكات جگە لەوانى تر، وە نزيكى ئەوە (لە پێناسە) هەموو ناوێك كە بگونجێ (ال) ى بچێتە سەر وەك (الرجل ، الفرس) .**

**وە دەڵێم : ناوى نەناسراو هەموو ئەو ناوانەن كە دانراون نەك بۆ ئەوە يەكێك تايبەت بكات لە خودى خۆى لە نێوانى تاكەكانى جنسى خۆى ، بەڵكو بۆ ئەوەيە بگونجێ بەكارى بێنى بۆ هەموو يەكێك (على سبيل**

**البدل)**[1].

**وەك (رجل) وە (إمراة) ئی یەكەم دروستە بەكاری بێنی بۆ هەموو نێرێكی بالغ لە ئادەمیزاد، دووەمیان درووستە بگوترێ بۆ هەموو مێیەكی بالغ لە ئادەمیزاد.**

**وە نیشانەی ناوی نەناسراو ئەوەیە كە بگونجێ كە (ال) بچێتە سەر وە بیناسێنی ، وەك (رجل) درووستە (ال) ی بچێتە سەر وە بیناسێنێ، دەڵێی (الرجل) وە هەروەها (غلام- جارية- صبي- فتاة- معلم) دەڵێ ی (الغلام- الجارية - الصبي- الفتاة - المعلم).**

## تدريب على الإعراب

اعرب الجمل الاتية:

الكِتابُ جلِيس مُمْتِعٌ »، « الطَّالِبُ الْمجْتَهِدُ يُحِبُّهُ أُسْتَاذُهُ) ، (الفَتَياتُ المُهَذَبَاتُ يَخْدُمْنَ بِلادَهُنَّ) ، (شَرِبتُ مِن الماءِ العذبِ).

## الجواب

١ . (الكتاب): مبتدأ مرفوع بالابتداء، وعلامة رفعه الضمة الظاهرةفي آخره، (جليس) : خبر المبتدأ، مرفوع بالمبتدأ وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره. (ممتع) : نعت لجليس، ونعت المرفوع مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره.

---

(1) **(على سبيل البدل) واتە ئەم ناوە (نكرة) یە بتوانی بەكاری بێنی بۆ هەر یەكێك لە ئەندامانی رەگەزەكە كە تۆ مەبەستتە ، بۆ نموونە دەڵێی (رايت امراةً) تۆ مەبەستت بەو (إمراة) یە ، بۆ نموونە ( زينب) بێت وە خواش زاناترە.**

٢ . الطالب: مبتدأ مرفوع بالابتداء، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره . (المجتهد): نعت (الطالب)، ونعت المرفوع مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره (يحب) : فعل مضارعمرفوع لتجرده من الناصب والجازم، وعلامة رفعه الضمة الظاهرةفي آخره، والهاء: ضمير الغائب مفعول به، مبني على الضم في محل نصب. و(أستاذ): فاعل (يحبُّ) مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره، والهاء ضمير الغائب مضاف إليه، مبني على الضم في محل خفض، والجملة من الفعل وفاعله في محل رفع خبر المبتأ الذي هو (الطالب)، والرابطُ هو الضمير المنصوب في (يُحِبُّه).

٣ . (الفتيات): مبتدأ مرفوع بالابتداء، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة. و(المهذبات): نعت لـ(الفتيات)، ونعتُ المرفوع مرفوعٌ، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة. (يخدم) : فعل مضارع مبني على السكون لاتصاله بنون النسوة، ونون النسوة فاعل، مبني على الفتح في محل رفع. و(بلاد): مفعول به لـ(يخدم) منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، و(بلاد) مضاف و(هُنَّ) ضمير جماعة الإناث الغائبات مضافٌ إليه، مبني على الفتح في محل خفض.

والجملة من الفعل والفاعل في محل رفع خبر المبتدأ الذي هو (الفتيات)، والرابطُ هو: نون النسوة في (يخدمن).

٤ . شرب: فعل ماض و (التاءُ) ضميرُ المتكلِّم فاعل، مبنيٌّ على الضمَّ في محل رفع، و(مِنْ): حرف جر، مبني على السكون لا محل له من الإعراب، و(الماءِ): مجرور بـ(من)، وعلامة جره الكسرةُ الظاهرة، والجار والمجرور متعلق بـ(شرب). و(العذب): نعت لـ(الماءِ)، ونعتُ المجرورِ مجرورٌ، وعلامة جره الكسرةُ الظاهرة في آخره.

# باب العطف / باسى (عطف)[1]

قال: وحروف العطف عشرة، وهي: ١ - (الوَاوُ)، وَ٢ -(الفَاءُ)، وَ٣ -(ثُمَّ)، وَ٤ -(أَو)، وَ(أَم)، وَ٦ -(إِمَّا)، وَ٧ -(بَل)، وَ٨ -(لا)، وَ٩ -(لَكِن)، وَ١٠ -(حَتَّى) في بَعضِ المَوَاضِعِ.

## حروف العطف

وأقول: للعطف مَعْنَيَانِ: أَحدهما لغويّ والآخر اصطلاحيٌّ.

أما معناه لغةً فهو: المَيْلُ، تقول: (عَطَفَ فُلَانٌ عَلَى فُلاَنٍ)، تريد: أَنَّه مال إِليه وأَشْفَقَ عليه.

**دانەر دەڵێ : پیتەكانی (عطف) دەنە كە ئەمانەن (١-الواو ٢-الفاء ٣-ثمَ ٤-او ٥-امْ ٦-إمّا ٧-بل ٨-لا ٩-لكن ١٠-حتی ، لەهەندێ شوێن).**

## پیتەكانی (عطف)

**وە دەڵێم (عطف) دوو مانای هەیە یەكێكیان لە زمانەوانیدا ، ئەوی تریان لە زاراوەدا .**

**مانای لە زمانەوانیدا واتە: دڵ بۆ چوون و خۆشەویستی، دەڵێی (عطف فلان علی فلانٍ) واتە: فلان كەس ڕووی لە فلانە كەس كردو ڕەحمی پێیدا هاتەوەو دڵی بۆی سووتا.**

---

(1) عطف لە ڕیزمان دا (إتباع كلمة بأخرى) ووشەیەك شوێنی ووشەیەك بكەوێ ، (حرف عطف) اداة عطف، ئامرازی پەیوەندی.

وأما العطف في الاصطلاح.. فهو قسمان: الأول: عطف البيان، والثاني: عطع النَّسَق.

فأما عطف البيان فهو:

(التَابعُ الجامد الموضَّح لمتبوعه في العارف المخصَّصُ له في النكرات).

فمثال عطف البيان في المعارف .. (جاءَني مُحَمَّدٌ أَبُوكَ) فـ(أبوك): عطفُ بيان على (محمد)، وكلاهما معرفة، والثاني في المثال موضِّح للأول، ومثاله في النكرات قوله تعالى: ﴿ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴾ فـ(صديد) عطفُ بيانٍ على (ماءٍ)، وكلاهما نكرةٌ، والثاني في المثال مخصِّصٌ للأوَّل.

**بەڵام ماناى (عطف) لە زاراوەدا ئەمەش دابەش دەبێت بۆ دووبەش: یەكەم: (عطف بیان) دووەم: (عطف النَّسق)**

**(عطف بیان) بریتیە لەو تابیعە جامیدەى كە روون كەرەوەیە بۆ مەتبوعەكەى ئەگەر مەعریفەو ناسراو بێت ، وە ئەگەر مەتبوعەكەى نەناسراو بێت ئەو تایبەت مەندى دەكات.**

**نموونەى (عطف البیان) بۆ مەعریفە (جاءني محمد أبوك) جاء: فعل ماض، النون: للوقاية ، الياء: مفعول (محمد) فاعل (أبوك) عطف بيان على محمد مرفوع بالواو لأنه من الأسماء الخمسة (الكاف) مضاف إليه.**

**(محمد) وە (أبوك) هەردووكیان مەعریفەن (ابوك) روون كەرەوەى (محمد)ە.**

**وە نموونەی (عطف بیان) بۆ نەکیرە نەناسراو خوا دەفەرموێ ﴿ مِن مَّآءٍ صَكِيدٍ ﴾[1] (صديد) (عطف) بەيانە بۆ (ماء) وە هەردووكيان نەكيرەنە (صديد) (ماء) تايبەت مەند دەكات.**

وأما عطف النسـق فهو:

(التَّابعُ الَّذي يتوسَّطُ بينه وبين متبوعه أَحدُ الحرُوُفِ العَشَرَةِ)

وهذه الحروف هي:

١ -الواو، وهي لمطلق[2] الجمع؛ فيُعطف بها

١ - المتقارنان، نحو: (جَاءَ مُحَمَّدٌ وَعَليٌ) إذا كان مجيئهما معاً.

ويعطف بها ٢ السابق على المتأخر، نحو: (جَاءَ عَلِيٌ وَمحْمُودٌ) إذا كان مجيءِ محمودٍ سابقاً على مجيءِ عليٍّ.

ويعطف بها ٣ -المتأخر على السابق، نحو: « جَاءَ عَلِيٌ وَمحمَّد».. إذا كان مجيءُ محمَّد متأخراً عن مجيءِ عليٍّ.

**وە (عطف نَسق) بريتيە لەو شوێنكەوتوو (تابع)ەی كە يەكێك لەم دە پيتەی خوارەوە دەكەوێتە نێوانی ئەو شوێن كەوتەو (متبوع)ەكەی، ئەم دە پيتەش ئەمانەن:**

---

(1) **(ابراهيم – ١٦) ﴿ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَكِيدٍ ﴾ واتە : وە لە كێماوو زووخاو ئاو دەدرێت.**

(2) **مطلق: عام، گشتی ، هەموو ، هەموان.**

**١- الواو ، گشتی بۆ کۆکردنەوەیە[١]، (عطف) دەکرێ بەهۆی (واو).**

**ا- المتقارنان : دوو پێکەوەبەستراو وەك (جاء محمد وعلي) ئەگەر هاتنەکەیان لەیەك کاتدا بێت.**

**ب- یەکێکیان کە پێشتر هاتووە لەوی تریان وەك (جاء علي و محمود) ئەگەر محمود پێشی عەلی هاتبێ.**

**ج- ئەوەی کە دواکەوتووە لەگەڵ ئەوەی کە لەپێش ئەو بووە وەك (جاء عليٌّ و محمد) ئەگەر هاتنی محمد لەدوای هاتنی عەلی بێت.**

٢ . الفاءُ، وهي للترتيب والتعقيب، ومعنى الترتيب: أَنَّ الثاني بعد الأَوَّلِ، ومعنى التعقيب: أَنَّه عقيبهُ بلا مُهلة، نحو: (قدِمَ الْفُرْسَانُ فالمشاةُ)[٢] إذا كان مجيء الفرسان ولم يكن بين قدوم الفريقين مُهْلَة.

٣ . (ثُمَّ)، وهي للترتيب مع التَّرَاخِي، ومعنى الترتيب قد سبق، ومعنى التراخي: أنَّ بين الأول والثاني مُهلة، نحو: (أَرْسَلَ اللهُ مُوسَى ثمُ عِيسَى ثمَّ مُحَمَّداً عَليهمُ الصَّلاةُ والسَّلامُ).

**٢- فاء: بۆ (ترتیب) و (تعقیب)ە، مانای (ترتیب) واتە ئی دووەم لەدوای ئی یەکەم بەبێ ئەوەی ماوە بکەوێتە نێوانیان وەك (قدم الفرسانُ فالمشاةُ) ئەمە ئەگەر هاتنی سوارییەکان لەپێش دابێت ، لە نێوانی هاتنی هەردوو کۆمەڵدا ماوەیەك نەبێت ، (مشاه) واتە: پیادە، لە نێوانی**

---

(1) لێرەدا مەبەستمان لەم (واو)ەیە کە مانای (عطف) دەداتەوە، دەنا (واو) مانای زۆرە.

(2) لە کوردی بۆ ئەم جۆرە (فاء)ە، (ئینجا) یا (ئەوجا) بەکاردێت دەڵێی : سوارییەکان هاتن ئینجا پیادە.

**هاتنی هەردوو کۆمەڵ دا ماوەیەك نەبێت. (مشاه) واتە: پیادە، ئەوەی بەپێ دەڕوات .**

**٣- ثُمَّ: لەبۆ (ترتیب) و (تراخي) یە ، مانای (ترتیب) مان باس کرد، مانای (تراخي) واتە لە نێوانی یەکەم دووەم ماوەیەك هەبێت وەك: (أَرْسَلَ اللهُ مُوسَى ثمَّ عِيسَى ثمَّ مُحَمَّداً عَليهِمُ الصَّلاةُ والسَّلامُ).**

٤ . (أوْ)، وهو للتخير أو الإباحة، والفرق بينهما أن التخيير لا يجوز معه الجمع.

والإباحة يجوز معها الجمع؛ فمثال التخيير (تَزَوَّجْ هِنْداً أَو أُختَهَا).

ومثال الإباحة (ادْرُسِ الفِقْهَ أَو النَّحوَ) فإن لديك من الشرع دليلاً على أنه لا يجوز الجمع بين هند وأختها بالزواج، ولا تشكُّ في أنه يجوز الجمع بين الفقه والنحو بالدراسة.

٥ . (أمْ)، وهي لطلب التعيين بعد همزة الاستفهام نحو:(أَدَرَسْتَ الْفِقْهَ أَمِ النَّحْوَ؟).

**٤- (أو) ئەمە بۆ هەڵبژاردن و سەرپشك کردن جائیزو حەلاَڵیە ، وە جیاوازی لە نێوانیان (تخيير) ئەوەیە نابێ لەگەڵ ئەودا جەمع بکرێ ، بەلاَم (إباحة) ئەوەیە دەتوانی لەگەڵ ئەودا جەمع بکرێ.**

**نموونە لەسەر هەڵبژاردەو سەرپشککردن (تخيير) (تزوج هنداً او أُختها).**

**وە نموونە لەسەر (إباحة) (أُدرسِ الفقهَ أو النّحوَ) ، تۆ بەڵگەت هەیە لە شەرع کە جائیز نی یە کە جەمع لە نێوانی هیندو خوشکەکەی بکەی لە مارەکردنیان ، وە گومانیش لەوەدا نی یە کە جائیزە جەمع بکەی لە**

**خوێندنی فیقهو نەحو.**

**٥- (أم) بۆ داواکردنی دیاری کردنە لەدوای هەمزەی پرسیارکردن وەك: (ادرستَ الفقهَ أمِ النحو) [ کەواتە تۆ دەبێ دیاری (تعیین) بکەی کە کامت خوێندووە نابێت بە (نعم) و (لا) وەڵام بدەیتەوە] .**

٦ . (إمَّا)، بشرط أن تُسْبَقَ بمثلِها، وهيْ مثل (أَوْ) في المعنيين، نحو قوله تعالى: ﴿ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾ ونحو:(تَزَوَّجْ إمّا هِنْداً وَإمَّا أُختَهَا).

٧ . (بَلْ)، وهي للإضراب، ومعناهُ جعلُ ما قبلها في حكم المسكوت عنه، نحو: (مَا جَاءَ مُحَمَّدٌ .. بَلْ بَكرٌ) ويشترط للعطف بها شرطان؛ الأول: أن يكون المعطوف بها مفرداً لا جملة، والثاني: ألا يسبقها استفهام.

**٦- (إمّا) [1] (حەرفی "عطف"ە) بە مەرجی ئەوەی (إمّا) یەکی وەکو خۆی لەپێش هاتبێ ، مانای (إمّا) وەکو دوو مانایەکەی (أو)ە [ کە لە خاڵی چوارەم باسکرا] وەك خوا دەفەرموێ :﴿ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾[2] وە وەك: (تَزَوَّجْ إمَّا هِنْداً وَإمَّا أُختَهَا).[ لێرەش (إمّا) ی دووەم بۆ (تخییر)ە، واتە: سەرپشك کردن.**

**٧- (بلْ) بۆ (إضراب)ە، واتە: ئەوەی پێش (بل) وەکو ئەوەی لێ بکرێ کە هەر قسەت لەبارەیەوە نەکردووە وەك (ما جاء محمد... بل بکرٌ)، وە**

---

(1) (إمّا) هەندێك دەڵێن حەرفی عطف نییە، لەمانە (ابن القیم).

(2) (محمد-٤) ئەم بەشە ئایەتە لە باسی دیلی کافرەکانە واتە: ئەنجا (دیلەکانیان) قایم ببەستنەوە، جا دواتر یا بە منەت و چاکە (بەرەڵایان بکەن) یا بە فیدیەو بریتی. [ کەواتە لێرەدا (إمّا) ی دووەم بۆ (اباحة) یە، چونکە دەکرێ هەندێك لە دیلەکان بە منەت و چاکە بەرەڵا بکرێن ، وە هەندێکی تریش بە فیدیەو بریتی.

**به مەرج گیراوە بۆ (عطف) کردن بە (بَلْ) دووشت ، یەکەم: دەبێ ئەوەی بە (بلْ) (عطف) دەکرێ تاك (مفرد) بێت (جملة) نەبێت [ مەبەست لێرە (مفرد) (مثنى) و (جمع) نەبێت ، بەڵکو (جملة) بێت] دووەم: پرسیاری بەپێش نەکەوتبێ.**

٨ . (لا)، وهي تنفي عما بعدها نفسَ الحكم الذي ثبت لما قبلها نحو: (جَاءَ بكرٌ.. لا خَالِدٌ).

٩ . (لكنْ)، وهي تدلُ على تقرير[1] حكم ما قبلها وإثبات ضده لما بعدَها، نحو: (لا أُحِبُّ الكسالَى، لكِنِ المُجتَهِدِينَ).

ويشترط للعطف بها ثلاثة شروط ١ - أن يسبقها نفي أو نهي، و٢-أن يكون المعطوف بها مفرداً، و٣- ألا تسبقها الواو.

**٨- (لا) نەفی ئەوەی دوای خۆی دەکات ، هەمان ئەو شتەی کە جێگیر بووە بۆ پێش خۆی وەك (جاء بکر لا خالد) واتە : بەکر هاتووە خالد نا.**

**٩- (لکن) ئەوەی پێش خۆی بەیان دەکات و ڕووندەکاتەوە ، وە پێچەوانەی ئەوەش جێگیر دەکات لەوەی کە لەدوای دێت ، وەك (لا أحبُّ الکسالى لکن المجتهدین).**

**[ لا: حرف نفي (احبُّ) فعل مضارع والفاعل ضمير مستتر تقديرهُ انا (الكسالى) مفعول به (لكن) حرف عطف (المجتهدين) معطوف منصوب بالياء لِانه جمع مذكر سالم] .**

**وە بە مەرج گیراوە بە (عطف) کردن بە (لکن) سێ شت ١- نەفی یا نەهی پێش (لکن) کەوتبێ ٢- (معطوف) دەبێت مفرد بێت (نەك جوملە**

---

(1) **تقرير: اتخاذ قرار، بەیان، بڕیاردان، ڕوونکردنەوە.**

**بێت ، وەك (المجتهدين) هەرچەندە جەمعیشە بەڵام جوملە نییە) (معطوف) ئەوەیانە کە لە دوای (لکن) دێت . ٣- واو پێش (لکن) نەکەوتبێ.**

١٠ . (حَتَّى)، وهي للتدريج والغاية[1]. والتدريجُ: هو الدلالةُ على انقضاءِ الحكم شيئاً فشيئاً، نحو: (يَمُوتُ النَّاسُ حَتَّى الأَنْبياءُ).

وتأتي (حتَّى) ابتدائية[2] غير عاطفةٍ، إذا كان ما بعدها جملة، نحو: (جاءَ أَصْحابُنا حتَّى خَالِدٌ حَاضِر) وتأتي جارَّةٌ نحو قوله تعالى: ﴿حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ﴾[3] ولهذا قال المؤلف: ( و"حتَّى" في بعض المواضع).

**١٠- (حتى) بۆ پلە بە پلەیی و تاوەکووە ، (تدريج) ئەمە ئاماژەیە بۆ نەمانی شتەکە یەك لەدوای یەك و پلە بە پلە وەك (يموت الناس حتى الأنبياء) واتە: خەڵك دەمرن تاوەکو پێغەمبەرانیش ، کەواتە ئەم رستەیە ئەم دوو مانایەی گرتە خۆ ، وە (حتى) بەمانای سەرەتاییش دێت ، ئەو کاتە نابێتە (حرف عطف) بەو مەرجەی ئەوەی لەدوای دێت جوملە بێت وەك (جاء أصحابنا حتى خالد حاضرٌ) واتە: هاورێکانمان هاتن تاوەکو خالیدیش ئامادەبوو ، (جاءَ أصحابنا) فعل ماض وفاعل و (نا) مضاف اليه (حتى) ابتدائية، (خالد حاضر) مبتدأ وخبر .**

**وە جار وایە (حتى) وەکو حەرفی جەڕ دێت ئەوەی دوای خۆی**

---

(1) **تدريج: پلە بە پلە ، یەك لەدوای یەك، (الغاية) تاوەکو.**

(2) **ابتدائية: استئنافية، سەرەتایی**

(3) **(القدر-٥) (حتى) حرف غاية و جرّ (مطلع) اسم مجرور بالكسرة وهو مضاف (الفجر) مضاف إليه مجرور بالكسرة.**

مەجرور دەكات وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ﴾ لەبەر ئەوە دانەر گووتی (و "حتی" في بعض المواضع) واتە لە هەندیٚ شویٚنی حەرفی (عطف)ە.

## حكم حروف العطف / ياسای پیتەكانی (عطف)

> قال: فإن عطفت على مرفوع رفعت، أو على منصوب نُصبت، أو على مخفوض خفضت، أو على مجزوم جزمت، تقُولُ: (قَامَ زيد وعمرٌو)، و(رأيتُ زَيداً وَعَمْراً)، و(مَرَرتُ بِزَيدٍ وَعمرٍو)، و(زيدٌ لَم يقُم ..وَلم يَقْعُدْ).

**دانەر دەڵێ : ئەگەر (عطف) ت كرد بۆ سەر مەرفوع ئەوە ووشەكەی دوای پیتە (عطف)ەكە مەرفوع دەبێت ، وە ئەگەر (عطف) ت كرد بۆ سەر (منصوب) ئەوە ووشەكەی دوای پیتە (عطف)ەكە (منصوب) دەبێت، یا ئەگەر (عطفت)ت كرد بۆ سەر مجرور ئەوە ئەوەی دوای پیتی (عطف) ەكە مەجزوم دەبێت ، دەڵێی (قَامَ زيد وعمرٌو)، و(رايتُ زَيداً وَعَمْراً)، و(مَرَرتُ بِزَيدٍ وَعمرٍو)، و(زيدٌ لَم يقُم ..وَلم يَقْعُدْ).**

**(قام زيد و عمرٌو):**

**قام: فعل ماض (زيد) فاعل (الواو) حرف عطف (عَمْرٌو) معطوف على زيد مرفوع بالضمة.**

وأقول: هذه الأحرف العشرة تجعل ما بعدها تابعاً لما قبلها في حكمه الإعرابي، فإن كان المتبوع مرفوعاً كان التابع مرفوعاً، نحو: (قابلني مُحَمَّد وخالِدٌ) فـ(خالد): معطوف على (محمَّد)، والمعطوف على المرفوع مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، وإن كان المتبوع منصوباً كان التابع منصوباً، نحو: (قابَلت مُحمَّداً وَخالداً) فـ(خالداً) معطوف على (محمد)، والمعطوف على المنصوب منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، وإن كان المتبوع مخفوضاً كان التابع مخفوضاً مثله، نحو: (مررتُ بِمُحَمَّدٍ وَخَالِدٍ) فـ(خالد) معطوف على (محمد)، والمعطوف على المخفوض مخفوض، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة، وإن كان المتبوع مجزوماً

كان التابع مجزوماً أيضاً، نحو: (لَمْ يَحْضُر خالِد أَو يُرسِل رَسُولاً) فيرسل: معطوف على يحضر، والمعطوف على المجزوم مجزوم، وعلامة جزمه السكون.

ومن هذه الأمثلة تعرف أن الاسم، وأن الفعل يُعْطفُ على الفعل.

**وە دەڵێم: ئەم دە پیتە ئەوەی دوای خۆی شوێنی پێش خۆی دەکەوێنێ لە یاسای (إعراب) ی ئەگەر شوێن کەوتە (متبوع) واتە ئەوەی پێش پیتی (عطف) مەرفوع بوو ئەوە شوێن کەوتەکە (تابع)ەکە مەرفوع دەبێت وەك (قابلني محمد و خالد) {قابَلَني : فعل ماض (النون) للوقاية (الياء) مفعول ، (محمد) فاعل (الواو) حرف عطف (خالد) معطوف على (محمد) والمعطوف على المرفوع مرفوع ، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة}.**

**وە ئەگەر (متبورع) (منصوب) بوو، ئەوە (تابع) واتە ئەوەی دوای پیتی (عطف) ئەویش (منصوب) دەبێت وەك (قابلتُ محمداً وخالداً) خالداً: معطوف على محمد ، والمعطوف على المنصوب منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة وە ئەگەر (متبورع) مەجرور بوو ئەو کاتە (تابع) یش مجرور دەبێت وەك (مررتُ بمحمد وخالد) مررتُ: فعل ماض وفاعل (بمحمد) جار و مجرور (الواو) حرف عطف (خالد) معطوف على محمد ، والمعطوف على المخفوض مخفوض وعلامة جره الكسرة الظاهرة، وە ئەگەر (متبورع) مەجزوم بوو ئەو کاتە (تابع) یش مەجزوم دەبێت وەك: (لم يَحضُر خالد او يُرسلْ رسولاً)**

**لم: حرف نفي وجزم وقلب، (يحضر) فعل مضارع مجزوم بالسكون (خالد) فاعل (او) حرف عطف (يُرسلْ) معطوف على (يحضر) وهو فعل مضارع مجزوم بالسكون والفاعل ضمير مستتر تقديره هو يعود إلى (خالد) (رسولاً) مفعول به منصوب بالفتحة .**

**لەم نموونانە دەزانی کە ناو (عطف) دەکرێ بۆ سەر ناو ، وە فیعل (عطف) دەکرێ بۆ سەر فیعل.**

# تدريب على الإعراب

أعرب الجمل الآتية:

ما رأيت محمداً لكن وكيله، زارنا أخوك وصديقه، أخي يأكل ويشرب كثيراً.

## الجواب

١. (ما): حرف نفي، مبني على السكون لا محل له من الإعراب. (رأى) من (رأيت): فعل ماض مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهوره اشتغال المحل بالسكون. و(التاءُ) ضمير المتكلم فاعل، مبني على الضم في محل رفع.(محمداً): مفعول به منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة.(لكن): حرف عطف.(وكيل) : معطوف على (محمد)، والمعطوف على المنصوب منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، و(وكيل) مضاف و(الهاءُ) ضمير الغائب مضاف إليه، مبنيٌّ على الضمَّ في محلَّ جرَّ.

٢ . (زار): فعل ماض مبني على الفتح لا محلَّ له من الإعراب، و(نا): مفعول به مبني على السكون في محل نصب. (أخو): فاعل مرفوع وعلامة رفعه الواو نيابة عن الضمة لأنه من الأسماء الخمسة، و(أخو) مضاف و(الكاف) ضمير المخاطب مضاف إليه مبني على الفتح في محل خفض، و(الواو) حرف عطف، و(صديق) معطوف على أخو، والمعطوف على المرفوع مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة.و(صديق): مضاف و(الهاءُ) ضميرالغائب: مضاف إليه، مبنيٌّ على الضمَّ في محَل خفض.

٣ . (أَخ) من (أخي): مبتدأ مرفوع بالابتداءوعلامة رفعه ضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها اشتغال المحل بحركة المناسبة، و(أَخ) مضاف و(ياءُ المتكلم) مضاف إليه، مبنيٌّ على السكون في محل خفض.(يأكل): فعل مضارع مرفوع

لتجرده من الناصب والجازم، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، والفاعل ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره هو يعود على (أخي)، والجملة من الفعل والفاعل في محل رفع خبر المبتدأ، والرابط بين جملة الخبر والمبتدأ هو الضمير المستتر في « يأكل » و(الواو) حرف عطف.(يشرب): فعل مضارع معطوف على (يأكل)، والمعطوف على المرفوع مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة.(كثيراً): نائب مفعول مطلق، منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة.

## باب التوكيد/ باسی بەهێزکردن

| |
|---|
| قال: التوكيد: « تابعٌ للمُؤكَّدِ في رَفعِهِ وَنَصبِهِ وَخَفضِهِ وَتَعرِيفِهِ ». |

وأقول: التأكيد. ويقال التوكيد. معناه في اللغة: التقوية، تقول: « أكَّدتُ الشيء » وتقول:« وكَّدتُهُ » أيضاً: إذا قويته.

وهو في اصطلاح النحويين نوعان، الأَوَّل: التوكيد اللفظي، والثاني: التوكيد المعنوي.

**دانەر دەڵێ : تەوكيد شوێنی (موكّد) دەكەوێ لە رەفع و (نصب) و جەڕو ناسراويدا.**

**وە دەڵێم : (تأكيد) وە پێشی دەڵێن (توكيد) [ ئەم دووە جياوازيان نييە] مانای لە زمان دا واتە : بە هێزكردن دەڵێ ی (اكدت الشيء) وە دەڵێی (وكّدتُهُ)، ئەگەر بەهێزی بكەی.**

**وە لە لێكدانەوەی زانايانی (نحو) (توكيد) دوو جۆرە ، يەكەم : (التوكيد اللفظي) دووەم: (التوكيد المعنوي).**

أما التوكيد اللفظي: فيكون بتكرير اللفظ وإعاجته بعينه أو بمُرادفِه[1]، سواءاً كان اسماً نحو: (جَاءَ مُحَمَّدٌ مُحَمَّدٌ) أم كان فعلاً نحو (جَاءَ جَاءَ مُحَمَّدٌ) أم كان حرفاً نحو (نَعَمْ نَعَمْ جَاءَ مُحَمَّدٌ) ونحو: (جَاءَ حَضَرَ أَبُو بَكْرٍ).

---

(1) مرادف: مترادف، متشابە، وێچوو، هاو واتا.

وأما التوكيد المعنوي فهو: « التابع الذي يرفع احتمال السهو(١) أو التَّجوُّز(٢) في المتبوع »، فإنَك لو قلت: (جَاءالأمِيرُ) احتمل أنك سَهَوْتَ أو تَوسَّعْتَ في الكلام، وأن غَرَضَكَ مَجِيءُ رَسولِ الأَمِيرِ، فإذَا قلتَ: (جَاءَ الأَمِيرُ نَفْسُهُ) أو قلت: (جَاءَ الأَمِيرُ عَيْنُهُ).. ارتفع الاحتمالُ وتَقَرَّرَ عند السَّامع أنك لم تُرِد إلا مجيءَ الأَمير نفسه.

**تەوكیدی لەفزی .. ئەمە بەوە دەبێت لەفزەكە بە خودی خۆی دووبارە بكرێتەوە یا لەفزێكی تر دووبارە بكرێتەوە كە بە ئەو بچێت ، جا ناو بێت وەك : (جاء محمد محمد) یا فیعل بێت وەك (جاء جاء محمد) یا حەرف بێت وەك: (نعم نعم جاءَ محمد) یا بە ئەو بچێت وەك (جاء حضر ابوبكر).**

**[جاء: فعل ماضي مبني على الفتح (حضر) توكيد لـ(جاء) مبني على الفتح (ابو) فاعل مرفوع بالواو لأنه من الأسماء الخمسة ، وهو مضاف (بكر) مضاف إليه] .**

**وە تەوكیدی مەعنەوی: ئەمەیان شوێن كەوتیەكە كە ئیحتمال و گونجانی بێ ئاگایی و سەهو ناهێڵێ ، یا لە بری شوێن كەوتەكە (متبوع) شتێكی ترت بەكار هێنابێت [ ئەو ئیحتمالەش ناهێلێ] ، ئەگەر گوتت (جاء الأمير) دەگونجێ تۆ سەهوت كردبێ ، یا فراوانیت كردووە**

---

**(1) سهو: غفلة، عدم انتباه، بێ ئاگایی ، ئاگا لێ نەبوون.**

**(2) التجوز في المتبوع: واتە لە بری شوێن كەوتەكە (متبوع) تۆ مەبەستت یەكێكی تر بێت (مجاز) واتە: شتێك بەكارهێنان لەبری شتێكی تر ، جا تەوكیدی مەعنەوی ئەو ئیحتمالەش ناهێلێ ، بۆ نموونە مەبەستت بە ئەمیر نێرراوی ئەمیر بێت.**

**له قسه كردن ، مەبەستت پیٚ نیٚرراوی ئەمیره ، جا ئەگەر گوتت (جاء الأمیر نفسهُ) یا گوتت(جاء الأمیر عینهُ) واته: ئەمیر به خودی خۆی هات، ئەو كاته ئیحتمال نامیٚنیٚ، وه روون دەبیٚتەوه لای گویٚگر كه تۆ تەنها مەبەستت هاتنی ئەمیره به خۆی.**

وحكمُ هذا التابع أنه يوافق[1] متبوعه في إعرابه، على معنى أَنَّه: إن كان المتبوعُ مرفوعاً ..كان التابع مرفوعاً أيضاً، نحو: (حَضَرَ خَالِدٌ نَفْسُهُ) وإن كان المتبوع منصوباً.. كان التابع منصوباً مثله، نحو: (حَفِظْتُ الْقُرْآنَ كُلَّهُ)، وإن كان المتبوع مخفوضاً.. كان التابع مخفوضاً كذلك، نحو: (تَدَبَّرْتُ فِي الْكِتَابِ كُلِّهِ) ويتبعه أيضاً في تعريفه، كما ترى في الأمثلة كلِّها.

**وه یاسای ئەم تابیعەش [ واته تەوكیدی مەعنەوی] وەك یەكن له (إعراب) دا لەگەڵ مەتبوعەكەی ، واته ئەگەر مەتبوع مەرفوع بوو ئەوه تابیعیش مەرفوع دەبیٚت وەك (حضر خالدٌ نفسُهُ) وه ئەگەر مەتبوع (منصوب) بوو، ئەوه تابیعیش (منصوب) دەبیٚت وەك (حفظت القرآن كُلَّه) وه ئەگەر مەتبوع مەجرور بوو ئەوه تابیعیش مەجرور دەبیٚت وەك (تَدَبَّرتُ فِي الكتابِ كُلِّهِ)[2] وه هەروەها له ناسراویش شویٚنی دەكەویٚ هەروەكو له هەموو ئەو نموونانەدا دەبینی.**

---

(1) **موافق: مطابق، وەك یەك، چونیەك.**

(2) **واته: لەهەموو كیتابەكه وورد بوومەوه (تدبرتُ) فعل ماض وفاعل (فِي الكتابِ) جار و مجرور (كلِّهِ) توكيد لـ(الكتاب) مجرور بالكسرة ، (الهاء) مضاف إليه.**

## ألفاظ التوكيد المعنوي / لەفزەكانی تەئكیدی مەعنەوی

قال: ويكون بألفاظ معلومة، وَهيَ: (النفَّسُ)، وَ(العَينُ)، وَ(كُلُّ)، وَ(أجمَعُ)، وَ(تَوَابعُ "أجمعُ")، وَهِيَ: (أَكتعُ)، وَ(أَبتَعُ)، وَ(أَبصَعُ)، تقولُ: (قَامَ زَيدٌ نَفسُهُ)، و: (رَأَيتُ القَومَ كُلَّهُم)، و: (مَرَرتُ بِالقَومِ أَجمَعِينَ).

**دانەر دەڵێ : تەوكیدی مەعنەوی بە چەند لەفزێكی زانراو دەكرێن كە ئەمانەن (النفس– العين– كل– اجمع – توابع اجمع) كە ئەمانەن (اكتع– ابتع– ابصع) دەڵێ ی: (قَامَ زَيدٌ نَفسُهُ)، (رَأَيتُ القَومَ كُلَّهُم)، (مَرَرتُ بِالقَومِ اَجمَعِينَ).**

**{مررت: فعل ماض وفاعل (بالقوم) جار و مجرور (اجمعين) توكيد معنوي مجرور بالياء}.**

وأقول: للتوكيد المعنوي ألفاظ مُعَيَنَةَ عَرَفها النُحاةُ من تتبُع كلام العرب ومن هذه الألفاظ: (النَّفسُ) و(الْعَيْنُ).

ويجب أن يُضاف كل واحدٍ من هذين إلى ضميرٍ عائدٍ على المؤَكَدِ . بفتح الكاف[1]..

فإن كان المؤكد مفرداً.. كان الضمير مفرداً، ولفظ التوكيد مفرداً أيضاً، تقول: (جَاءَ عِليٌ نَفْسُهُ)، و: (حَضَرَ بَكرٌ عَيْنُهُ).

وإن كان المؤكد جمعاً كان الضمير ضميرَ الجمع ولفظُ التوكيد مجموعاً أيضاً، تقول: (جَاءَ الرِّجالُ أَنفُسُهم)، و: (حَضَرَ الْكُتَّابُ أعْيُنُهُمْ).

---

(1) بفتح الكاف: واتە ووشەكەی پێشی كە (مؤكد)ە . پیتی كافەكەی فەتحەدارە.

وإن كان المؤكد مثنى؛ فالأفصح أن يكون الضمير مُثَنّىً، ولفظ التوكيد مجموعاً، تقول: (حَضَرَ الرَّجلاَنِ أَنْفُسُهُمَا) و (جَاءَ الْكَاتِبَانِ أَعْيُنُهُمَا).

**وە دەڵێم: تەوكیدی مەعنەوی چەند لەفزێكی دیاری كراوی هەیە زانایانی نەحو زانیویانە لە بەدواداچونیان بۆ قسەی عارەبان لەو ئەلفزانە (النفس) وە (العين).**

**وە پێویستە هەر یەكێك لەم دووانە پاڵ بدرێنە (إضافة) بكرێن بۆ راناو (ضمير) ێك كە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی توكید كراوە.**

**ئەگەر تەوكید كراوەكە تاك بوو ئەوە (ضمير)ەكەش تاك دەبێت، وە لەفزی توكیدیش ئەویش تاك دەبێت، دەڵێ ی (جاءَ على نفسه)[1] (حضر بكر عينهُ) وە ئەگەر تەوكید كراو كۆ (جمع) بوو، ئەوە راناویش كۆ دەبێت وە لەفزی تەوكیدەكەش ئەویش كۆ دەبێت وەك (جاء الرجال انفسهم) (حضر الكتابُ اعينهم) وە ئەگەر تەوكید كراو جووت بوو روونتر و ئاشكرا تر وایە كە راناوەكەش جووت بێت، وە لەفزی تەوكیدیش كۆ (جمع) بێت، وەك (حَضَرَ الرَّجلاَنِ أَنْفُسُهُمَا) (جَاءَ الْكَاتِبَانِ أَعْيُنُهُمَا).**

ومن ألفاظ التوكيد: (كلُّ)، وَمِثْلُهُ (جَمِيعٌ) ويشترط فيهما إضافةُ كلّ منهما إلى ضمير مطابِق للموكّد، نحو: (جَاءَ الْجَيْشُ كُلُّهُ) و (حَضَرَ الرِّجَالُ جَمِيعُهُمْ).

ومن الألفاظ (أَجْمَعُ) ولا يؤكد بهذا اللفظ غالباً إلا بعد لفظ (كُلّ) ومن الغالب قوله تعالى: ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴾ ومن غير الغالب قول الراجز:

---

**(1) (على) تەوكید كراوە ، تاكیشە (نفس) تەوكیدە و تاكە، هائی(نفس) یش بۆ (على) دەگەڕێتەوە كە هەردووكیان تاكن، (جاءَ) فعل ماض (علي) فاعل (نفسه) توكيد مرفوع بالضمة (الهاء) مضاف إليه.**

## (إذَن ظَلِلتُ الدَّهرَ أبكي أجمعًا)

وربما احتيج إلى زيادة التقوية، فجيء بعد (أَجمع) بألفاظ أخرى، وهي: (أَكْتَعُ) و (أَبْتَعُ) و (أَبْصَعُ) وهذه الألفاظ لا يؤكَّدُ بها استقلالاً، نحو: (جَاءَ الْقَوْمُ أجمعُون، أكْتَعُون، أبْتَعُون، أبْصَعُونَ) والله أعلم.

**وه لـەفزەكانی تەوكیـد (كـل) وه وێنـەی ئـەویش (جمیـع) وه بەمـەرج گـیراوه هـەر یـەكێك لـەم دووه پـاڵ بدرێنـه (إضـافة) بكـرێ بـۆ رانـاو (ضـمیر)ێك كـه وەكـو تەوكیـد كراوەكـه بێـت وەك ( جـاء الجـیش كُلُّـهُ) (حضر الرجـال جمیعهم) وه لـەفزەكانی تەوكیـد (اجمـع) تەوكیـد نـاكرێ بـەم لـەفزه بـه زۆری ئـیللا لـەدوای (كـلّ) نـەبێت لـەو زۆرانـەش خـوا دەفـەرموێ ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴾[1] وه نموونـەش لەسـەر ئەوەی كه بە غالیبی بەكار نەیەت قسەی راجزه كە دەڵێ : (إذَن ظَلِلْتُ الدَّهرَ أَبْكي أَجْمعَا) [2]**

**وه هەندێ جار پێویست به زیاده بـه هێزكردن بووه له دوای (أجمع) هەندێ له فزی تری هاتووه كه ئەمانەن (اكتع- ابتع- ابصع) ئەو لەفزانه بـه تـەنیا تەوكیـدیان پـێ نـاكرێ ، وەك (جَـاءَ الْقَـوْمُ أجمعُـون، اكْتَعُـون، اَبْتَعُون، اَبْصَعُونَ) وه خواش زاناتره.**

---

**(1) (ص-٧٣) (فسجد) الفاء: حرف عطف(سجد) فعل ماض (الملائكة) فاعل (كلهم) توكيد مرفوع بالضمة (هم) ضمير مبني على السكون في محل جر مضاف إليه (أجمعون) توكيد ثانٍ مرفوع بالواو.**

**(2) إذاً: حرف جواب (ظللتُ) (ظلّ) فعل ماض ناقص، والتاء اسمه (الدهر) ظرف زمان (أبكى) فعل مضارع ، وفاعله ضمير مستتر تقديره أنا، والجملة في محل نصب خبر ظلّ (اجمع) توكيد للدهر .**

# تدريب على الإعراب

أعرب الجمل الآتية:

قَرَأْتُ الْكِتَابَ كُلَّهُ ، زَارَنَا الوَزِيرُ نَفْسُهُ ، سَلَمْتُ عَلَى أَخِيك عَيْنِه ، جَاءَ رِجالُ الْجَيْشِ أَجْمَعُونَ .

١. (قرأ): فعل ماض، مبنيٌّ على فتح مقدَّر على آخِرِه منع من ظهوره اشتغالُ المحلِّ بالسكون العارض لدفع كراهة توال أَرْبَعِ متحركات فيما هو كالكلمة الواحدة، و(التاءُ) ضمير المتكلم فاعلٌ، مبني على الضم في محل رفع، و(الكتاب) مفعول به منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، و(كل): توكيد ل(الكتاب)، وتوكيد المنصوب منصوب، وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، و(كلّ) مضافٌ و(الهاء): ضمير الغائب مضاف إليه، مبني على الضم في محل خفض.

٢ . (زار): فعل ماض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب، (نا) مفعول به مبنيٌّ على السكون في محل نصب، (الوزيرُ): فاعل (زار) : مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره، و(نفس): توكيد للوزير، وتوكيد المرفوع مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، و(نفس) مضاف و(الهاءُ) ضمير الغائب مضاف إليه، مبنيٌّ على الضمِّ في محل خفض.

٣. (سلَّمت): فعل وفاعل، (على) : حرف خفض مبني على السكون لا محل له من الإعراب، (أخي): مخفوض ب(على)، وعلامة خفضه الياء نيابة عن الكسرة لأنه من الأسماء الخمسة، و(أَخي) مضاف و(الكافُ) ضمير المخاطب مضاف إليه، مبنيٌّ على الفتح في محل خفض، (عين): توكيد (لأخي)، وتوكيد المخفوض مخفوض، وعلامة خفضه الكسرةُ الظاهرة، و(عين) مضاف و(الهاء) ضمير الغائب مضاف إليه، مبنيٌّ على الكسر في محلِّ خفض.

٤. (جاءَ): فعل ماض مبني على الفتح لا محل له من الإعراب، (رجال): فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة في آخره، و(رجال) مضاف، و(الجيش): مضاف إليه مخفوض، وعلامة خفضه الكسرة الظاهرة، و(كلّ): توكيد لـ(رجال)، وتوكيد المرفوع مرفوع، وعلامة رفعه الضمة الظاهرة، و(كلّ) مضاف، و(هم) : ضمير جماعة الغائبين: مضاف إليه، مبنيٌّ على السكون في محل خفض، (أَجمعون): توكيد ثانٍ مرفوعٌ، وعلامة رفعه الواوُ نيابةً عن الضمَّة لأَنَّه جمعُ مذكّرٍ سالم.

# البدل وحكمه / بەدەل و یاساکەی

قال: إِذَا أُبدل اسمٌ مِنَ اسمٍ أَوْ فعِلٌ مِن فِعل تَبِعَهُ فِي جمَيع إعرَابِهِ.

وأقول: البَدَل معناه في اللغة: العِوَض، تقول: (استبدَلْتُ كذا بكذا)، و(أَبْدَلْتُ كذا مِنْ كذا)؛ أي: اسْتَعَضْتُهُ منه.

وهو في اصطلاح النحويين (التابعُ المقصودُ بالحكم بلا واسطة).

وحكمُه أنه يتبع المبدَلَ منه في إعرابه، على معنى أَنَّه إن كان المبدل منه مرفوعاً كان البدلُ مرفوعاً، نحو: (حَضَرَ إبراهيمُ أبُوكَ) وإن كان المبدل منه منصوباً كان البدل منصوباً، نحو: (قَابَلْتُ إبراهيمَ أَخَاكَ) وإن كان المبدل منه مخفوضاً كان البدلُ مخفوضاً، نحو: (أَعجبتني أَخلاقُ مُحَمَّدٍ خَالِكَ) وإن كان المبدل منه مجزوماً.. كان البدل مجزوماً، نحو: (مَن يَشْكُرْ رَبَّهُ يَسْجُدْ لَهُ يَفُزْ).

**دانەر دەڵێ : ئەگەر ناوێك كرایە بەدەل لە بری ناوێك یا فیعلێك لە بری فیعلێك ، ئەوە لە هەموو (إعراب) یدا شوێنی دەكەوێ.**

**وە دەڵێم: (بدل) لە زمان دا واتە: لە جیاتی ، لەبری، دەڵێ ی (استبدلتُ كذا بكذا) وە (ابدلت كذا من كذا) واتە: شتەكەم بە بەدەل لەبری ئەو دانا.**

**وە مانای (بدل) لە زاراوەدا ئەوەیە (شوێنكەوتوویەكە كە ئەو مەبەستە بە حوكمی جوملەكە بەبێ واسیتە).**

[ المقصود بالحكم[1] : واتە (بدل) ئەو مەبەستمان پیٚ یەتی شتێکی سەرەکی یە لەناو رستەکەدا وەکو نەعت و تەوکیدو (عطف بیان) نین، کە تەواوکەری مەقسوودی سەرەکین ، تەنها (عطف نسق) نەبێت کە ئەمیش مەقسودی سەرەکیە بەلاّم کە گوتوویەتی (بلا واسطة) ئەوە (عطف نسق) یش دەردەچیٚ ، چونکە (عطف نسق) بە واسیتەیە ، بۆ نموونە بە هۆی (واو) (عطف) دەکریٚ] .

وە حوکمی بەدەل : شوێنی –مبدل منه) [ واتە ئەوەی پێش خۆی] دەکەویٚ لە (إعراب) دا، بەو مانایەی ئەگەر (مبدل منه) مەرفوع بوو ئەوە بەدەلیش مەرفوع دەبێت وەك (حضر إبراهيم أبوك) وە ئەگەر (مبدل منه) (منصوب) بوو ئەوە بەدەلیش (منصوب) دەبێت وەك (قابلت ابراهيمَ اخاك) وە ئەگەر (مبدل منه) مەجرور بوو ئەوە بەدەلیش مەجرور دەبێت وەك (اعجبني اخلاق محمد خالِك) وە ئەگەر (مبدل منه) مەجزوم بوو ئەوە بەدەلیش مەجزوم دەبێت وەك (من يشكرُ ربَّه يسجدُ له يفز) (يشكر (مبدل منه) (يسجد) بدل.

اعرابي (مَنْ يَشكُرْ ربَّهُ يَسجدْ لَهُ يَفُزْ)

من: اسم شرط جازم يجزم فعلين في محل رفع مبتدا (يشكرُ) فعل مضارع مجزوم بالسكون وهو فعل اللشرط والفاعل ضمير مستتر تقديره

---

(1) المقصود بالحكم / فصل اخرج عطف البيان والنعت والتوكيد ، لأنها مُكَملات للمقصود وليست مقصودة و (بلا واسطة) فصلٌ آخر أخرج عطف النسق ، وظاهر التعريف: أن المبدل منه ليس مقصوداً بالحكم ، وإنما ذكر بعد التوطئة ومقدمة للبدل ، لأن ذكر المقصود بالحكم بعد التوطئة لذكره يفيد توكيد الحكم وتقريره (الفتوحات القيومية).

هو (ربَّه) مفعول به (الهاء) مضاف إليه ى(يسجد) بدل مجزوم بالسكون (له) جار و مجرور (يَفن) فعل مضارع وهو جواب الشرط مجزوم وعلامة جزمه السكون والفاعل ضمير مستتر تقديره هو، الشرط وجوابه في محل رفع خبر المبتدأ (مَن).

# أنواع البدل / جۆرەكانی بەدەل

قال: وَهُوَ على أربعةِ أقسامٍ: ١ -بَدَلُ الشَّيءِ مِن الشَّيءِ، و٢ -بَدَلُ البَعضِ مِنَ الكُلِّ، و٣- بَدَلُ الاشتِمَالِ، و٤- بَدَلُ الغَلَطِ، نَحوُ قَولِكَ: (قَام زَيدٌ أَخُوكَ)، وَ: (أَكَلتُ الرَغِيفَ ثُلُثَهُ)، و: (نَفَعَنِي زَيدٌ عِلمُهُ)، و: (رأَيتُ زَيداً الفرَسَ)، أردت أن تقول (الفرَسَ) فَغَلِطت فأبدلت زيداً مِنهُ.

**دانەر دەڵێ: بەدەل چوار بەشە ١- بەدەلی شتێك لە بری شتێك ٢- بەدەلی هەندێك لە هەموو ٣- بەدەلی لە خۆگرتن ٤- بەدەلی هەڵەو ناڕاست، وەك (قام زيد اخوك) (اكلت الرَّغيف ثلثه) (نفعني زيد علمه) (رايت زيداً الفرس) دەتویست بڵێ ی (الفرسَ) ... بەڵام هەڵەت كرد لە بری ئەو گوتت (زيداً) {رايت: فعل ماضي و فاعل (زيداً) مفعول به (الفرسَ) بدل منصوب بالفتحة}.**

## وأقول: البدلُ على أربعة أنواع:

**النوع الأوَّلُ**: بدل الكلِّ من الكلِّ، ويسمى البدل المطابق، وضابطُه: أن يكون البدل عَيْنَ المبدَل منه، نحو: (زَارَنِي مُحَمَّدٌ عَمُّكَ).

**النوع الثاني**: بدلُ البعض من الكلِّ، وضابطه: أن يكون البدلُ جزءً من المبدل منه، سواءٌ أكان أَقَلَّ من الباقي أم مساوياً له أَم أكثر منه، نحو: (حفِظْتُ القُرْآنَ ثُلُثَهُ) أو (نِصْفَهُ) أو (ثلثَيْهِ).

ويجب في هذا النوع أَنْ يضاف إلى ضمِير عائدٍ إلى المبدَل منه، كما رأيتَ.

## وە دەڵێم : بەدەل چوار جۆرە :

**جۆری یەکەم** : بەدەلی هەموو لەبری هەموو ، وە ناو دەنرێ بە بەدەلی چونیەك وەك یەك، وە قاعیدەی ئەم بەدەلەش ئەوەیە بەدەل هەمان خودی (المبدل منه) وەك (زارني محمد عمك).

{(عم) لێرەدا بەدەلی (محمد)ە، کە هەردووکیان یەك مرۆڤن ، واتە: موحەمەدی مامت سەردانی کردم ، (زار) فعل ماض (النون) للوقاية (الياء) ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب مفعول به (محمد) فاعل (عمك) بدل (الكاف) مضا إليه} .

**جۆری دووەم**: بەدەلی هەندێك لەهەموو ، وە قاعیدەو بنچینەی ئەوەش ئەوەیە کە بەدەل بەشێکە لە (المبدل منه) جا بەدەلەکە کەمتر بێت لەوەی ماوە یا یەکسان بێت لەگەڵ ئەوەی کە ماوە ، یا زیاتر بێت لەگەڵ ئەوەی کە ماوە وەك : (حفِظْتُ القُرآنَ ثُلُثَهُ) یا (نِصْفَهُ) یا (ثُلُثَيْهِ).

{حفظت القرآن : فعل ماض و فاعل و مفعول به (ثلثه) و (نصفه) بدل منصوب بالفتحة (الهاء) مضاف إليه (ثُلُثَيْهِ) [1] بدل منصوب بالياء لأنه مثنى (الهاء) مضاف إليه}.

وە پێویستە ئەم جۆرە بەدەلەش کە (إضافة) بکرێ بۆ (ضمير) ێك کە بگەڕێتەوە بۆ (المبدل منه) وەك بینیت.

---

(1) (ثُلُثَيْهِ) واتە دوو (ثُلث) یانی دوو بەش لە سێ بەش، مەعلومیشە کە (مثنى) یا (جمع مذكر سالم) کە (إضافة) کران نونەکانیان نامێنن (ثلثين) (مثنى)یە، بەڵام لەبەر ئەوەی (إضافة) کرایە، نونەکەی لابراوەو قرتێندراوە.

**النوع الثالث**: بدلُ الاشتمال، وضابطه: أَن يكون بين البدل والمبدَل منه ارتباط بغير الكلِّية والجزئيَّة، ويجب فيه إضافةُ البدل إلى ضَمِيْرٍ عائد إلى المبدَل منه أَيضاً، نحو: (أَعْجَبَتْني ٱلجَارِيَةُ حَدِيثُهَا) و « نَفَعَنِي الأُستاذ حُسنُ أَخْلاقِهِ).

**جۆری سێیەم: بەدەلی لەخۆگرتن ، قاعیدەی ئەم بەدەلەش ئەوەیە کە لە نێوانی بەدەل و (مبدل منه) پەیوەندیەکی مەعنەوی هەیە جگە لە هەموو و بەش بەشی، وە پێویستە لەم جۆرە بەدەلە (بدل) (إضافة) پاڵ بدرێتە لای راناوێك کە ئەم راناوە بگەڕێتەوە بۆ (مبدل منه) وەك (أَعْجَبَتْني ٱلجَارِيَةُ[1] حَدِيثُهَا) و « نَفَعَنِي الأُستاذ حُسنُ اخْلاقِهِ)، واتە : جوانی رەوشتی مامۆستاکە سوودی پێگەیاندم.**

**{نفعني : فعل ماض (النون) للوقاية (الياء) ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب مفعول به (الاستاذ) فاعل (حسنُ) بدل (الاستاذ) مرفوع بالضمة (اخلاقه) مضاف اليه (الهاء) مضاف إليه}.**

**النوع الرابع**: بدل الغلطِ، وهذا النوع على ثَلاثَةِ أَضْرُبٍ:

١ . بدل البَداءِ، وضابطه: أن تقصد شيئاً فتقوله، ثم يظهر لك أن غيره أفضلُ منه فتعدل إِليه، وذلك كما لو قلت: (هذهِ الجارية بَدْرٌ) ثم قلت بعد ذلك: (شَمْسٌ).

٢ . بدل النسيان، وضابطه: أن تبني كلامك في الأول على ظنٍّ، ثم تعلم خطأهُ فتعدل عنه، كما لو رأيت شَبَحاً من بعيد فظننتَه إِنساناً فقلت: (رأَيتُ إِنساناً) ثم قرب منك فوجَدْتَه فَرَساً، فقلت: (فَرَساً).

٣ . بدل الغلط، وضابطه: أَن تريد كلاماً فيسبق لسانُكَ إِلى غيره.. وبعد النطق تعدل إِلى ما أَرَدْتَ أَوّلاً، نحو: (رَأَيْتُ مُحَمَّداً الفرسَ).

---

(1) **الجارية: ئافرەتی کۆیلە، یا کچی گەنج، یا ئافرەتی رەش پێست (زنجية).**

**جۆری چوارەم**: بەدەلی هەڵە، ئەم جۆرە دابەش دەبێت بۆ سێ بەش

١- بەدەلی بەدەرکەوتن و ئاشکرا بوون، قاعیدەی ئەمەش ئەوەیە تۆ مەبەستت شتێکە دەیڵێی ، لە پاشان بۆت دەردەکەوێ و ئاشکرا دەبێت کە غەیری ئەوە باشترە جا ئەو دەبێژی ، ئەمەش وەکو ئەوە بڵێ ی (هذهِ الجاريةُ بدر) لە پاشان بڵێی (شمسٌ).

٢- بەدەلی لەبیرکردن : قاعیدەی ئەم بەدەلەش ئەوەیە : تۆ قسەکەت یەکەم جار لەسەر گومان بینا بکەی لەپاشان بزانی کە هەڵەیە لێی لابدەی بیگۆڕی ، هەروەکو لەدوورەوە تارماییەك ببینی وا گومان ببەی کە ئینسانە بڵێی (رايتُ إنساناً) لە پاشان نزیك بۆوە ، بینیت ئەسپ بوو، جا بڵێی (فَرساً) (١)

٣- بەدەلی هەڵە: بنچینەو قاعیدەی ئەمەش ئەوەیە : تۆ دەتەوێ قسەیەك بکەی بەڵام زمانت شتێکی تر دەڵێت، جا لەدوای قسەکردن بۆلای ئەوە لادەدەی ئەوە دەڵێی کە یەکەم جار مەبەستت بوە بیڵێی وەك (رايت محمداً الفرسَ)

{رايت: فعل وفاعل (محمداً) مفعول به (الفرسَ) بدل منصوب بالفتحة}.

---

(1) فرس: بەئەسپ و ماین دەگوترێ.

## منصوبات الأسماء/ ئەو ناوانەی کە (منصوب) دەبن

قال: المنصوباتُ خمسة عشر، وهيَ: ١- المفعولُ بِهِ، و٢- المصدرُ، و٣- ظرفُ الزمانِ، و ظرفُ المكانِ، و٤- الحال، و٥- التمييزُ، و٦- المُستثنى، و٧- اسم لا، و٨- المُنادى، و٩- المفعول من أجله، و١٠- المفعولُ معهُ، و١١- خبرُ (كان وأخواتِها)، واسم إن واخواتها، والتابعُ للمنصوب، وهو أربعة أشياء: ١٢- النَّعتُ، و١٣- العطفُ، و١٤- التوكيدُ، ١٥- البدلُ .

**دانەر دەڵێ : (منصوبات) (١٥) نە کە ئەمانەن .... بۆ ئەم (١٥) دانەیە بگەڕێوە بۆ مەتنەکە .... وە لەمەودواش یەکە بە یەکە باسیان دەکرێ.**

## عدد المنصوبات، وأمثلتها

أقول: يُنْصَبُ الاسْمُ إذا وقع في موقع من خمسة عشر موقعاً.

وسنتكلم عن كلّ واحد من هذه المواقع في باب يخصه، على النحو الذي سلكناه في أبواب المرفوعات، ونضرب لها ههنا الأمثلة بقصد البيان والإيضاح.

١ . أن يقع مفعولاً به، نحو (نُوحاً) من قوله تعالى: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا ﴾

٢ . أن يقع مصدراً، نحو (جَذَلاً) من قولك: (جَذِلَ مُحَمَّدٌ جَذَلاً).

٣ . أن يكون ظرف مكان أو ظرف زمان؛ فالأول نحو (أَمَامَ الأُستاذ) من قولك: (جَلَسْتُ أَمامَ الأُستاذِ) والثاني نحو (يَوْمَ الْخَمِيس) من قولك: (حَضَرَ أَبي يَوْمَ الْخَمِيسِ).

**ژمارەی (منصوبات) و نموونەیان**

**دەڵێم: ناو (منصوب) دەبێت ئەگەر کەوتە یەکێك لەم پازدە شوێنانە وە لەمەودوا قسە دەکەین لەسەر هەر یەکێك لەم شوێنانە لە باسێك کە تایبەتی دەکەین بە ئەو، وەك ئەوەی کە پێیدا ڕۆیشتین لە باسی مەرفوعات ، وە لێرەشدا نموونە دەهێنینەوە بۆ (منصوبات) بە مەبەستی ئاشکرا کردن و روون کردنەوە:**

**١- ئەگەر بووە (مفعول بە) وەك (نوحاً) لە ووتەی خوا ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا ﴾[1]**

**٢- ئەگەر بووە چاووگ (مصدر) وەك (جذلاً) لە (جذِلَ محمد جذلاً)[2]**

**٣- ئەگەر بووە (ظرف مكان) یا (ظرف زمان) نموونە لەسەر ئی یەکەم وەك (أمامَ الأُستاذِ) لە (جلست أمام الأستاذ) وە نموونە لەسەر ئی دووەم وەك (يوم الخميس) لە (حضر أبي يومَ الخميس) (حضر) فعل ماض (ابي) فاعل مرفوع وعلامة رفعه ضمة مقدرة على آخِرِهِ منع من ظهورها اشتغال المحل بحركة المناسبة وهو مضاف (الياء) مضاف إليه (يوم) ظرف زمان منصوب بالفتحة وهو مضاف (الخميس) مضاف إليه.**

---

(1) (نوح-١) (إنا) ، إن: حرف توكيد ونصب ، نا: ضمير مبني على السكون في محل نصب اسم إن (أرسلنا) فعل ماض مبني على السكون نا: ضمير مبني على السكون في محل رفع فاعل ، والجملة في محل رفع خبر (إن) (نوحاً) مفعول به منصوب بالفتحة .

(2) جذل : فعل ماض (محمد) فاعل (جذلاً) مفعول مطلق منصوب بالفتحة (موحەمەد دڵخۆش بوو بە دڵخۆش بوون).

٤ . أن يقع حالاً، نحو(ضَاحِكًا) من قوله تعالى: ﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا ﴾

٥ . أن يقع تميزاً، نحو (عَرَقاً) من قولك: (تَصبَّبَ زَيدٌ عَرَقاً).

٦ . أن يقع مستثنى، نحو (مُحَمَّداً) من قولك: (حَضَرَ القَوْمُ إلا مُحَمَّداً).

٧ . أن يقع اسماً لـ("لا" النافية)، نحو (طالبَ عِلْم) من قولك: (لاطَالبَ عِلْم مَذْمُومٌ).

٨ . أَن يقع مُنادى، نحو: (رَسُولَ اللهِ) من قولك: (يَا رَسُولَ اللهِ).

**٤- ئەگەر بووە حال وەك (ضَاحِكًا) لە ووتەى خوا ﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا ﴾.[1]**

**٥- ئەگەر بوو بە تەميز وەك (عرقاً) لە (تصببَ زيد عرقاً) عرقاً: تمييز منصوب بالفتحة .**

**٦- ئەگەر بووە (مستثنى) وەك (محمداً) لە (حضر القوم إلا محمداً).**

**٧- ئەگەر بووە ناو بۆ (لا) ى نافية ، وەك (طالَب علم) لە (لا طالبَ علم مذموم).**

**٨- ئەگەر بووە بانگ كراو (منادى) وەك (رسولَ الله) لە (يا رسول الله) يا: حرف نداء (رسولَ) منادى منصوب بالفتحة وهو مضاف (الله) لفظ الجلالة مضاف إليه.**

٩ . أن يقع مفعولاً لأجله، نحو (تأدِيباً) من قولك: (عَنَّفَ الأسْتاذُ التَّلْميذَ

---

(1) **(نمل-١٩) (فتبسم) الفاء: حرف عطف، (تبسم) فعل ماض مبني على الفتح والفاعل ضمير مستتر تقديره هو (ضاحكاً) حال منصوب بالفتحة.**

تأدِيباً).

١٠ . أن يكون مفعولاً معه، نحو (المصباح) من قولك: (ذَاكَرْتُ والمصْباحَ).

١١ . أن يقع خبراً لـ(كان) أَو إِحدى أَخواتِها، أو اسماً لـ(إن) أو إِحدى أَخواتِها؛ فالأَوَّل نحو: (صَدِيقاً) من قولك: (كان إِبْرَاهيمُ صدِيقاً لِعَليّ)، وَالثاني نحو (مُحَمَّداً) من قولك (لَيْتَ مُحَمَّداً يَزُورُونَا).

**٩– ئەگەر بووە (مفعول لأجله) وەك (تاديباً) لە (عنَّفَ الأسْتاذُ التِّلْميذَ تاديباً).**

**[ واتە: مامۆستاكە توندو تيژ بوو لەگەڵ قوتابييەكە بۆ تەمبێ كردنی، عنف: فعل ماض، الأستاذ: فاعل، التلميذ: مفعول به، تأديباً: مفعول لأجله منصوب بالفتحة] .**

**١٠– ئەگەر بووە (مفعول معه) وەك (المصباح) لە (ذاكرتُ والمصباح).**

**١١– ئەگەر ناو بووە خەبەری (كان) و هاو وێنەكانی ، يا (اسم) (إنَّ) و (هاوشێوەكانی ، نموونە لەسەر ئی يەكەم (صَديقاً) لە (كان ابراهيمُ صديقاً لِعليّ) وە نموونە لەسەر ئی دووەم وەك (محمداً) لە (ليت محمداً يزورُنا).**

**{ليت: حرف تمن ونصب (محمداً) اسم ليت منصوب بالفتحة (يزورُنا) فعل مضارع + فاعل مستتر + مفعول به ، والجملة في محل رفع خبر ليت}.**

١٢ . أن يقع نعتاً لمنصوب، نحو (الْفَاضِل) من قولك: (صَاحِبْتُ مُحَمَّداً الْفاضل).

١٣ . أن يقع معطوفاً على منصوب، نحو (بكْراً) من قولك: (ضَرَبَ خَالِدٌ عَمْراً وَبَكْرا).

١٤ . أَن يقع توكيداً لمنصوب، نحو (كُلَّهُ) من قولك: (حَفِظْتُ الْقُرآنَ كُلَهُ).

١٥ . أن يقع بدلاً من منصوب، نحو (نِصْفَهُ) من قوله تعالى: ﴿ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ۝٢ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ۝٣ ﴾

١٢- ئەگەر بووە نەعت بۆ ناوێکی (منصوب) وەك (الفاضل) لە (صاحبتُ محمداً الفاضل).

١٣- ئەگەر (عطف) کرا بۆ (منصوب) وەك (بكراً) لە (ضَرَبَ خَالِدٌ عَمْراً وَبَكْرا).

١٤- ئەگەر تەوکید بوو بۆ (منصوب) وەك (كلَّهُ) لە (حَفِظْتُ الْقُرآنَ كُلَهُ).

١٥- ئەگەر بەدەل بوو بۆ (منصوب) وەك (نصفه) لە ووتەی خوا ﴿ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ۝٢ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴾[1].

---

(1) (مزمل-٢-٣) (قم) فعل أمر ، والفاعل ضمير مستتر تقديرهُ أنت (الليلَ) ظرف زمان منصوب بالفتحة (إلا) حرف استثناء (قليلاً) مستثنى منصوب بالفتحة، (نصفه) بدل منصوب بالفتحة من (الليل) الهاء: ضمير مبني على الضم في محل جر مضاف إليه، (أو) حرف عطف (انقص) فعل أمر والفاعل ضمير مستتر تقديره أنت (منه) جار ومجرور (قليلاً) مفعول به منصوب بالفتحة.

## باب المفعول به / باسی (المفعول به)

> قال: وهُو: الاسمُ، المنصُوبُ، الذي يقَعُ عَلَيهِ الفِعلُ، نحو قولك: (ضَرَبتُ زَيداً و (رَكَبتُ الفَرَسَ).

وأقول: المفعول به يطلق عند النحويين على ما استجمع ثلاثةَ أمور:

الأول: أن يكون اسماً؛ فلا يكون المفعول به فعلاً أو حرفاً.

والثاني: أن يكون منصوباً؛ فلا يكون المفعول به مرفوعاً ولا مجروراً.

والثالث: أن يكون فعلُ الفاعل قد وَقَعَ عَليهِ، والمراد بوقوعه عليه تَعَلُّقه به، سواءً أكان ذلك من جهة الثبوت، نحو: (فَهِمْتُ الدَّرْسَ) أم كان على جهة النفي، نحو (لمْ أَفْهَمِ الدَّرْسَ).

**دانەر دەڵێ : (مفعول به) ناوێکی (منصوب)ە، ئەوەیە کە فیعلی فاعیلێکی دەکەوێتە سەر وەك (ضربت زیداً) وە (رکبت الفرس).**

**وە دەڵێم: (مفعول به) لای نەحویەکان بەوە دەگوترێ کە سێ مەرجی تیادا کۆبێتەوە.**

**یەکەم: دەبێ ناو بێت ، کەواتە (مفعول به) نابێت نە فیعل نە حەرف بێت.**

**دووەم: دەبێ (منصوب) بێت، کەواتە (مفعول به) نابێت نە مەرفوع نە مەجرور بێت.**

**سێیەم: دەبێ فیعلی فاعیلی کەوتبێتە سەر ، مەبەست لە کەوتنە سەری فیعلی بۆسەر مفعول ئەوەیە پێیەوە بەسترابێتەوە، جا ئەم**

بەسترانەوەیە لە ڕووی جێگیر بوون بێت وەك (فهمت الدَّرس) یا لە رووی نەفی بێت وەك (لم افهم الدرس) .

{لم: حرف نفي وجزم وقلب (افهم) فعل مضارع مجزوم بالسكون وقد كُسِّر لإلتقاء الساكنين، والفاعل ضمير مستتر تقديره (أنا) الدرس: مفعول به منصوب بالفتحة}.

# أنواع المفعول به / جۆرەكانی (المفعول به)

قال: وهو قسمان: ١ -ظاهر، و٢ -مضمر.

فالظاهِرُ ما تقدم ذِكْرُهُ، وَالْمُضمَرُ قسمان: ١ -مُتَّصِلُ، و٢ -مُنْفَصِلٌ، فالمُتَصِلُ اثنا عشر، وَهِيَ: ضَرَبني، و:ضَرَبَنا، وضَرَبَكَ. وَ:ضَرَبَكِ، وَ:ضَرَبكُمَا، وَ:ضَرَبَكُنَّ، و:ضَرَبَهُ، و:ضَرَبَها، و:ضَرَبَهما، و:ضَرَبَهم، و:ضَرَبَهُنَّ.

والمنفصل اثنا عشر، وهي: إيَّايَ، و: إيَّانا، و:إيَّاكَ، و:إياكِ ، و: إياكُمَا، و: إيَّاكم، و:إيَّاكُنَّ ، و: إيَّاهُ، و: إيَّاهَا، و:إيَّاهُمَا، و:إيَاهُم، و:إيَّاهُنَّ.

**دانەر دەڵێ : (مفعول به) دوو جۆرە ١- ئاشكرا ٢- شاراوە (واتە بەشێوەی راناو (ضمیر).**

**(مفعول به) ی ئاشكرا ئەوە بوو كە لەپێش ئەمە باس كرا ، وە (مفعول به) ی شاراوە واتە ئەوەی بەشێوەی (ضمیر) هاتووە دوو بەشە:**

**١- پێكەوە لكاو ، گەیەنراو (متصل).**

**٢- جیاكراوە، جوێ (منفصل).**

**جا (مفعول به) ی پێكەوە لكاو دوازدەیە كە ئەمانەن (ضَرَبَني، بۆ ئەمە سەر لە مەتنەكە بدە).**

**وە (مفعول به) ی جیا كراوە ئەمەش دوازدەیە كە ئەمانەن (إيَّايَ ... بۆ ئەمەش سەر لە مەتنەكە بدە).**

وأَقول: ينقسم المفعول به إلى قسمين: الأول الظاهر. والثاني: المضمَر.

وقد عرفت أن الظاهر ما يَدُلُّ على معناه بدون احتياج إلى قرينة تكلم أو خطاب

أو غَيبة، وأن المضمَر ما لا يدل على معناه إلا بقرينةٍ من هذه القرآئن الثلاث؛

فمثال الظاهر (ضرب محمد بكراً) و (يضرب خالد عَمْراً) و (قَطَفَ إسماعيلُ زهرةً) و (يقطف إِسْمَاعِيلُ زَهْرَةً) .

**وه دەڵێم (مفعول به) دابەش دەبێت بۆ دوو بەش یەکەم ئاشکرا ، دووەم: شاراوە [ واتە ئەوەی لە شێوەی راناو (ضمیر) داهاتووە] ، وە زانیت کە (مفعول به) ئاشکرا ئەوەیە کە خۆی لە خۆیدا مانا دەداتەوە بەبێ پێویست بوون بە قسەکردن و قسەلەگەڵ دا کردن و غایبێتی وە (مفعول به) شاراوە ئەوەیە مانای بەدیار ناکەوێ تەنها بەهۆی ئەو سێ پەیوەندیە نەبێت کە باسمان کرد [ کە لەمەودوا بەتایبەتی لەکۆتایی ئەم بابەتە ئەم سێ پەیوەندی و قەرینە روون دەبنەوە] .**

**نموونە لەسەر (مفعول به) ئاشکرا (ضرب محمد بكراً) و (يضرب خالد عَمْراً) و (قَطَفَ إسماعيلُ زهرةً) و (يقطف إِسْمَاعِيلُ زَهْرَةً) .**

**{يقطف : فعل مضارع، اسماعيل :فاعل ، زهرة : مفعول به منصوب بالفتحة}.**

وينقسم المضمَر المنصوب إلى قسمين: الأَوَّل المتَّصلُ؛ والثاني المنفصل.

أَما المتَّصل فهو: ما لا يُبتدأُ به الكلام ولا يصح وقوعه بعد (إلا) في الاختيار.

وأما المنفصل فهو: ما يُبتدأُ به الكلام ويصح وقوعه بعد (إلا) في الاختيار.

**وه (مفعول به) (منصوب) ی شاراوە (واتە ئەوەی بەشێوەی (ضمیر) هاتووە) دابەش دەبێت بۆ دووبەش : یەکەم گەیەنراو (متصل) دووەم جیاکراوە (منفصل).**

**(متصل) ئەوەیە قسە ناکرێ بۆ ئەو دەست پێ بکات ، وە ناشکرێ بە**

